# ڕێبەرێکی کورت بۆ پاراستنی شار



# دەربارەی نووسەر

جۆن سپێنسەر توێژەر و پرۆفیسۆر و نووسەر و سەربازی کۆنە و چەندین خەڵاتی بەدەستهێناوە، هەروەها لە ئاستی نێودەوڵەتیدا بڕواپێکراوە وەک شارەزای بواری جەنگی ناو شار و بابەتی سەربازیی تر، لە بواری جەنگی ناو شاردا بە باشترین زانا دا دەنرێت لە جیهاندا، ئەو وەک ڕاوێژکاری سەربازی کاری کردووە بۆ فەرماندەی چوار ئەستێرەی ئەمریکا و هەروەها چەندین سەرکردەی سەربازیی تر لە لەشکری ئەمریکادا وەک بەشێک لە کۆمەڵێکی توێژینەوەی ستراتیجی ئەمریکی لە پێنتاگۆنەوە بۆ پەیمانگای سەربازیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

سپێنسەر، لەم کاتەدا سەرۆکی دەستی لێکۆڵینەوەی شێوازی شەڕکردنی ناو شارە لەگەڵ کۆڕی مادیسۆندا، ئەم ماوەیەی پێشوو سەرۆکی دەستەی لێکۆڵینەوەی شێوازی شەڕکردنی ناو شار بوو لە پەیمانگای مۆدێرن وار لە وێست پۆینت، هەروەها بەڕێوەبەری هاوبەشە لە پرۆژەی شەڕکردنی ناو شار و لە هەمان کاتدا کاردەکات وەک پێشکەشکار لە پۆدکاستی (Urban Warfare Project). ئەو لە پاسەوانی ویلایەتی کالیفۆرنیا پلەی عەقیدی هەبووە و لەگەڵ ٤٠ەمین لیوای سەربازی پیادەی پاسەوانی نەتەوەیی ویلایەتی کالیفۆرنیا کاریکردووە وەک بەڕێوەبەری ڕاهێنانی شێوازی شەڕکردنی ناوشار.

جۆن، زیاتر لە ٢٥ ساڵ خزمەتی هەیە لە لەشکری چالاکدا وەک سەربازێکی پیادە، لەو کاتەدا چەندین پلەی جیاوازی هەبووە لە پرایڤەتەوە بۆ پلەی چاوەشی پێشڕەو و

لە ئەفسەری جێگرەوە بۆ پلەی رائید، دوو جار وەک سەرباز دامەزراوە لە شوێنی شاریدا لە عێراق، هەردووکی وەک سەرکردەی دەستەی سەربازی پیادە دامەزراوە، جۆن سپێنسەر، هەروەها کاریکردووە وەک فێرکاری پاسەوانی دارستانی ئەمریکا لە پەیمانگای سەربازی نایابی پاسەوانانی دارستان، لە ژێر ڕاهێناندا بووە لە دەستەی سەرۆکایەتی ئەرکان و لەشکر، هەروەها کاری کردووە لەگەڵ کۆمەڵی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لەشکری ئەمەریکا و دامەزرێنەر و جێگری بەڕێوەبەرە لە پەیمانگای مۆدێرن وار لە وێست پۆینت.

لە تویتەر دەتوانی ئەکاونتەکەی بدۆزیتەوە لە ژێر ناوی: @spencerguar

# ئەم ڕێبەرە بۆ کێ نووسراوە

ئەم ڕێبەرە کورتە بۆ هەر کەسێکە کە بۆ ئازادی و سەربەستی و مافی چارەنووس و مافی یەکسانی مرۆڤ و دیموکراسییەت دەجەنگێت، بۆ ئەو شەڕڤانانەیە کە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە جەنگێکی ڕەوا دەکەن.

ئەمە بۆ ئەو کەسانە نییە کە دەیانەوێ مرۆڤ بچەوسێننەوە، بۆ ئەو کەسانەش نییە کە پشتگیری لە فاشیزم و دیکتاتۆریەت و داگیرکاری و ئیمپیریالی دەکەن، ئەمە بۆ ئەو سەرباز و شەڕڤانانە نییە کە تاوانی جەنگ و تاوان دژی مرۆڤایەتی دەکەن.

# ناوەڕۆک

# فەرمانە هەمیشەییەکانی سپێنسەر (بۆ هێزی بەرگری شار)

**1.** بەرگریکردن بەهێزترین شێوازی جەنگە، پێویستە هێرشبەرەکە بێت بۆت و پێویستە لە جێگای ئامادەکراو بیت، ئەو پێویستە بۆی کە بپەڕێتەوە لە کۆڵان و شەقامی کراوە بۆ ئەوەی هێرشت بۆ بەرێت، لە کۆڵان و شەقامەکان هێرشبە

**2.** هەرگیز مەوەستە لە ئامادەکردن و بەهێزکردنی هێڵی بەرگریت، تەنانەت لە کاتی شەڕکردنیشدا پێویستە بەردەوام بیت لە بەهێزکردنی جێگاکەت کە شەڕی لێوە ئەکەیت.

**3.** وا لە هێرشبەرەکە بکە بچێتە ئەو جێگایەوە کە خۆت دەتەوێ، نەک ئەو جێگایەی کە خۆی دەیەوێت، کۆست و بەربەستەکانت تا ئەتوانی بەرزبکەرەوە، هەموو کۆڵان و جادەکان بگرە، هەموو دەرگا و پەنجەرەکان بگرە، شارەکە وەک قەڵایەک لێ بکە بە دیوار، بۆ ئەوەی دوژمنەکانت ناچار بکەی بە داوەکانتا بڕۆن.

**4.** چیمەنتۆ بەکاربهێنە، کۆنکرێت باشترین کەرەستەیە بۆ بەرگریکردن، دار و تووڕەکە و گوێنی لم بەکارمەهێنە چونکە بێهێزن و بەرگە ناگرن، چیمەنتۆ کە پتەودەکرێت بە شیشی پۆڵاین دەبێتە یەکێک لە پتەوترین و بەهێزترین مادەکان، لەو ماددەیەوە بەربەست و جێی شەڕکردن دروست بکە.

**5.** بەردەوام خۆت و جێگای شەڕکردنت  و چەکەکانت بشارەوە، بەردەوام وا هەستبکە کە دوژمن دەتوانن لە سەرەوە بتبینن، وە ئەگەر بوبینن ئەوە واتە دەتوانن موشەک و هاوەن و بۆمبت تێبگرن، بەڵام ئەگەر بەردەوام لە شاردنەوەدا بیت، بەردەوام لە ناو بیناکاندا بجوڵێیت و لەسەرەوە ئاشکرا نەبیت، ئەوە دوژمن ناتوانێت لێت بات.

**6.** هەموو شوێنێکی ژێرزەمین بەکاربێنە، ئەگەر هیچ ژێرزەمینێک نەبوو، دەست بکە بە هەڵکەنینی زەوییەکەی ژێر خۆت، چونکە هێرشکەرەکە پێش هێرشکردن بۆمبارانت دەکات، ئەوکاتە دەتوانی ئەو ژێرزەمینە بەکاربهێنیت بۆ خۆشاردنەوە و ڕاکردن و پاراستنی خۆت، هەروەها بۆ کۆگەکردنی پێداویستی، جوڵەکردن و بۆ هێرشکردنی پێچەوانە.

**7.** گرنگترین شت سوپرایزکردنی دوژمنەکانتە، هێرشبەرەکە ناتوانێ بە نێو چیمەنتۆ و دیوارەکاندا بتبینێ، لەبەر ئەوە تۆ بڕیاری ئەوە دەدەیت کەی شەڕ دەست پێدەکات، دوژمن بەردەوام لە نیشانەشکێن و قەنناس دەترسن، بۆیە وا لە هێرشکەرەکان بکە هەست بکەن کە هەموو پەنجەرەیەکی شارەکە قەناسێکی لێوەستاوە.

**8.** بەردەوام بە کۆمەڵ شەڕ بکەن، یەک شەڕکەر باش نییە، پێویستە بە لایەنی کەمەوە هەر تیپە و ٣-٥ کەسی تێدابێت.

**9.** بەردەوام لە جێگای شاراوەوە هێرش بەرن کە باش پارێزراوە، گرنگ نییە گەر شتێک هەڵدەدەیت یان شتێک دەتەقێنی، ئەگەر دەیکەی ئەوە لە ناو بیناوە بیکە، لە نهۆمی بەرز یا نزمەوە، لە پشت دیواری هاڕدراو و ڕوخێنراو، یاخود لە ژێرزەمینەوە.

**10.** بەردەوام با پیلانێکت هەبێ بۆ پاشەکشەکردن پێش هەموو هێرشێکت، ئیتر ئەوە لە ڕێی ئەوەوە بێت کە کون بکەیتە دیوار و بنمیچەکانەوە بۆ ئەوەی بتوانی لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر بە ئاسانی بڕۆی گەر دوژمن دەستی کرد بە بۆمببارانکردن یان ئەگەر زۆر نزیک بوون لێتەوە، تونێل هەڵبکەنە لە ژێر بیناکاندا بۆ ئەوەی ئاسان ڕابکەی، چەندین شوێنی جیاوازی هێرشبردن دروستبکە کە بەناویەکداچوون، پێش کاتی هێرشەکە لە هەموو شوێنێکدا کە تەقەی لێوە دەکرێت فیشەک و ڕومانە و ئاو و پێداویستی تر دابنێ.

**11.** هەرگیز مەهێڵە دوژمن سوپرایزت بکات، دوژمن لە شەڕی نێو شار دەترسێ، بۆیە هەوڵدەدات کە بە دزییەوە بەرگرییەکانت تێپەڕێنێ، بۆیە نابێت هەرگیز ڕێژەیەکی زیاتر لە ٣/٢ی شەڕکەرەکانت بخەون.

**12.** ئاو بخۆرەوە، ئەگەر بمریت ناتوانی شەڕبکەی، تەنها دەتوانی ٣ ڕۆژ بمێنیتەوە بێ ئاو، بەڵام دەتوانی ٣ هەفتە بێ خواردن بمێنیتەوە، هەر ئاوێکت هەبێ پاکیبکەرەوە بە باشی، ئیتر ئەوە بە کوڵاندنی ئاوەکە بێت یان بەکارهێنانی سپیکەرەوە(تایت) یان یۆد، ئەگەر میزەکەت سپی بێت کێشە نابێت، ڕەنگی زەرد و قاوەیی واتە داماوی.

**13.** پێش نانخواردن دەستت بشۆ، نەخۆشی ئەگەری زیاتری هەیە بتکوژێت وەک لە فیشەکی دوژمن، کاتێک دەخۆیت و دەخۆیتەوە با شوێنی پیسایی‌کردنەکەت لە دووری ١٠٠ مەترەوە بێت، مەهێڵە مێروو بچنە خواردنەکانتەوە.

**14.** پێویستە ڕێشوێنی بنەماکان جەنگ بیت، پێویستە نیشانەی تایبەتت پێوە بێت بۆ ئەوەی جیاتبکاتەوە وەک شەڕکەر، تەکتیکەکانی دوژمنەکەت هەرچی شتێک بێت، پێویستە پەیڕەوی بنەماکانی جەنگ بیت، هەروەها بنەمای مامەڵەکەردن لەگەڵ دوژمنە دەستبەسەرگیراوەکان.

# بۆچی بەرگری دەکەین؟

هێزی بەرگری ناو شار دەجەنگێن بۆ پاراستنی خێزانەکانیان و هەڤاڵەکانیان، بۆ پاراستنی کۆمەڵگەکەیان و نەتەوەکەیان و ئازادییەکەیان.

هێزی بەرگری شار پێویستە بەردەوام خۆیان و دەوروبەریان بیرهێننەوە کە بۆچی دەجەنگن و بۆچی بەرگری دەکەن.

لە ڕووی سەربازییەوە، هۆکاری بەرگریکردن ئەکرێ تەنها بۆ ئەوە بێت کات بەدەست بێنن یان هێزێکی داگیرکەر خاوبکەنەوە یان بووەستێنن.

کات شتێکی زۆر گرنگە بۆ هێرشبەر، تا هێرشەکە زیاتر بخایەنێت ئەوە داگیرکردنی شارەکە گرانتر دەکات بۆیان، چونکە تا کات زیاتر بڕوات ئەوە کەلووپەلی زیاتر بەکاردەهێنن، تا زاتر سەربازەکانیان بڵاوبنەوە و هێرش بەرن ئەوە هەلی شکستیان زیاتر دەبێت.

بە بەدەستیهێنانی کات بۆ هێزی بەرگری دەکرێ ببێتە هۆی هاتنی هێزی زیاتر بۆ یارمەتیدان لەگەڵ هاتنی کەلووپەلی زیاتر بۆ هێزی بەرگری، هەروەها کاتی زیاتر واتە هێزی نێودەوڵەتی زیاتر دەتوانن بێن یارمەتییان بەن.

# ویستی جەنگکردن

"ورە بۆ جەستە وەک ژمارە سێ وایە بۆ یەک"
- ناپلیۆن بۆناپارت

خاڵی هێزی سەرەکی هێزی بەرگریکار ورەی جەنگیانە، ویستیان بۆ جەنگ.

هێزی بەرگری شار بۆ نەتەوەکەیان و ئازادی و خێزانەکانیان و یەکتری دەجەنگن.

هێزی بەرگری شار پێویستە بەردەوام باوەڕیان بە بردنەوە و سەرکەوتن بێت، ئەوان خاڵی بەهێزیان هەیە لە ژینگەی ناو شاردا.

ڕێگە مەدە بە ترس بێتە دڵتەوە، هەموو کەس لە جەنگدا هەست بە ترس دەکات، ئازایەتی ئەوەیە بەردەوام بیت لە جەنگاندن تەنانەت کاتێک هەست بە ترسیش دەکەیت.

هێزی بەرگری شار دەبێت هەوڵبدات کە ترسی تۆقێنەر بخاتە دڵی دوژمنەکانیانەوە، وایان لێ بکەن کە ویستی جەنگیان نەمێنێت.

# تیمی جەنگی دروستکەن

تیمی جەنگی دروستکەن، یەک بەرگریکار بەهێزە، بەڵام تیمێک لە بەرگریکار دەتوانن سەرکەوتوو بن.



پێکهێنانی تیمی جەنگی ڕێگەیەکە بۆ شکاندنی ترس و نەهێشتنی خەمۆکی و هەستی کووشندەی دیکە، هەر یەکە لە ئەندامەکانی تیمەکە بۆ یەکتری و بۆ تیمەکە دەجەنگن.

# ٨ بنەماکانی هێرشکردنە سەر شار

چەند بنەمایەک هەن کە ڕێگری لە هێزی سەربازی دەکەن لە هێرشکردنە سەر شارێک، بەرگریکەرێکی لێهاتوو دەتوانێ هەریەکێ لەم بنەما و لاوازییانە بەکاربهێنێت لە دژی هێرشکەرەکە، بنەماکان ئەمانەن:

١. **بەرگریکەری شار خاڵی بەهێزی هەیە**، چونکە هێزێکی زۆر زیاتری دەوێت بۆ هێرشکردنە سەر و تێکشکاندنی هێزێک کە لە بەرگریدایە و خۆیان باش پاراستووە و بەرگری پێویستیان داناوە لە شارەکەیا، زۆر ئەستەمترە لەوەی هێرشکەیتە سەر هێزێک لە جێگایەکی کراوەدا.

٢. **ئاڵۆزیی شار بەرژەوەندی هێرشکەر کەمدەکاتەوە لە بوارەکانی زانیاری و پێشە پشکنین(ڕیکۆن)دا، هەروەها سوودی هێرشی ئاسمانی و مەودای گولەهاویشتن کەمدەکاتەوە.**

٣. **بەرگریکەر دەتوانێ هێرشکەر ببینێت و لێیبات، چونکە هێرشکەر شوێنی خۆپاراستن و خۆشاردنەوەی کەمە**، گرنگترین بەرژەوەندی کە بەرگریکەر هەیبێت ئەوەیە کە دەتوانێ لە بینا و ژێرزەمینەکاندا شاراوە بمێنێتەوە.

٤. **بیناکان وەک شوێنی سەربازیی پتەوکراو کاردەکەن لێرەدا**، شار هەمووی پڕیەتی لە بینا و شوێن کە زۆر باشن بۆ مەبەستی سەربازی، ئیتر ئەو شوێنانە بینای حکوومی بێت، یا بینای پیشەسازی بێت، ئەو شوێنانە زۆربەی کات لە چیمەنتۆ دروستکراون و بە شیشی پۆلایین پتەوکراون، ئەوەش وایان لێدەکات کە زۆر خۆڕاگر بن بەرامبەر هێرش.

٥. **هێرشکەرەکان پێویستە کە هێزی تەقەمەنی بەکاربێنن بۆ ئەوەی بچنە بیناکانەوە**، لەم کاتەدا، شێوازەکانی هێرشبردنە سەر شارێکی پڕ بەربەست ئەوەیە بیرۆخێنی یان جێگاکا پڕ بکەی لە تەقەمەنی و پاشان سەربازی پیادە بنێریتە ناوەوە بۆ ئەوەی نهۆم بە نهۆم و ژوور بە ژوور بەرگریکەرەکان بکوژن.

٦. **بەرگریکەر بە بەراورد بە هێرشکەر ئازادی جووڵەکردین زیاترە**، ئەوان دەتوانن کە ژینگەکەی دەوروبەریان بە شێوەیەک بڕەخسێنن کە کارئاسانییان بۆ بکات و بە پێی

پێویست بجوڵێن، ئەوان دەتوانن شوێنی جەنگ پێکەوە ببەستنەوە بە ڕێگەی ژێر و نێو بیناکانەوە، ئەوان دەتوانن بەربەست دروستبکەن کە وەک تەڵەیە وابێ بۆ هێرشکەرەکان و بە بێئاگایی یان بە ناچاری بکەونە ناوییەوە، چونکە لە ژینگەی ناوشاردا ئازادی جوڵە کەمە.

٧. **ژێرزەمین وەک پەناگەی بەرگریکەر وایە،** بەرگریکەر دەتوانن تونێلە ژێرزەمینییەکان بەکاربێنن کە خۆیان هەن یان ئەگەر نین دەتوانن هەڵیکۆڵن و خۆیان بشارنەوە و خۆیان بپارێزن لە هێرشی ئاسمانی و تەنانەت دەتوانن وەک ڕێگایەک بەکاری بێنن بۆ هێرشبردنە سەر دوژمنێکی وەستاو.

٨. **نە هێزی بەرگری و نە هێزی هێرشکەر ناتوانن هێزەکانیان چڕبکەنەوە بەرامبەر ئەوەی تر،** ئەگەر بەرگرییەکی بەهێز ئامادەبێ لە ناوچەیەکی چڕێ شاریدا، ئەوە ڕێگری لە جووڵەی خێرا دەکات و ڕێگری دەکات لەوەی کە پێکهاتەی چڕ بەکاربێنرێت بەرامبەر خاڵە گرنگەکانی شارەکە.

# شەش بەشی سەرەکی هەر بەرگریکردنێک

ئەم شەش بەشە لە بەرگریکردندا بۆ هەموو جۆرە بەرگریکردنێک دەبن بە بێ جیاوازی قەبارە و شوێنی جەنگەکە. لە کاتی بەرگریکردن لە ناو شاردا، بەرگریکەر پێویستە بەردەوام بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن بتوانێت ئەو ناوچەیەی دەوروبەری خۆی بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی بتوانن هەم دوژمن بووەستێنن و هەم ئەو کارانە بکەن کە دەیانەوێت. شەش بەشە سەرەکییەکە ئەمانەن:

- **ئامادەکاری** – کاتێک بەرگریکەری شارەکە بڕیار دەدات لە نێو شارەکەدا بجەنگێ، پێویستە پلان دابڕێژی و ناوچەکە بە پێی پلانەکانی خۆی بگونجێنێ، نابێت هەرگیز بووەستێت لە خۆ ئامادەکردن، تەنانەت لە کاتی شەڕکردنەکەشدا، دەتوانن کۆمەڵێک کەسیان هەبێت بۆ شەڕکردن و کۆمەڵێکی تر بۆ دروستکردنی بەربەست و باشترکردنی جێگاکە.

- **توانای خۆ گونجاندن** – هەموو هێڵی بەرگری پێویستە توانای خۆگونجاندنیان هەبێت بۆ ئەوەی کردەوەی هێرشکەرەکان بگۆڕن، ئەمە لە سەرەتا بۆ کۆتایی بەرگریکردنەکە گرنگە.

- **ئاسایش** – هێزی بەرگری شارەکە پێویستە دڵنیابنەوە کە هەموو بەشەکانی شارەکە مسۆگەرە لە ڕووی ئاسایشەوە، هەر جێیەکی شەڕکردن پێویستی بە زیاتر لە یەک کەسە بۆ ئاسایش.

- **توانای ئۆپەراسیۆنی قوڵ** – واتە بەرگریکەرەکان توانای ئەوەیان هەبێ لە دوورترین مەوداوە  یان لە بازنە و سنوورەکانی شارەکەوە دوژمن بکوژن.

- **تێکدان (سابۆتاژ)** – بەکارهێنانی شارەکە بۆ تێکدانی پێکهاتە و کاروانی دوژمن، هەروەها جیاکردنەوەی تانکی دوژمن لە سەربازە پیادەکانیان.

- **مانۆڕ (مناوەرە)** – بەکارهێنانی هەردوو لە بەرگریکەری خێرا و ئاگر.

- **بارستایی و چڕکردنەوە** – ئامادە بە کە لە کاتی گرنگی شەڕەکەدا کۆمەڵی گەورەی بەرگریکەر بەکاربهێنیت بەرامبەر بە هێرشکەرەکان.

# پێداویستی کۆبکەرەوە

جەنگی ناو شار، بە بەرگریکردنیشەوە، چوار ئەوەندەی جەنگی ناوچەی گوندی پێویستی بە فیشەکە.

لەگەڵ موشەکی ئاراستەکراوی دژە تانکدا (ATGM) وەک Javelin و NLAW، بەرگریکەرەکان پێویستیان بە فیشەک و ڕومانە و مینی دژە تانک و مینی دژە پیادەیەکی زۆرە، هەروەها درۆن و هاوەن و گولەی هاوەن و ئاو و خۆراکی خۆڕاگر کە تێکناچێ، لەگەڵ سەرچاوەی وزە (بۆ چێشتلێنان و لێخوڕین و بۆ مۆلیدە)

بەرگریکەر پێویستی بە چییە؟




**زۆر گرنگ**

١- ژمارەیەکی زۆر لە فیشەک
٢- ژمارەیەکی زۆر لە ڕومانە
٣- ئاو
٤- خۆراکی ئامادەکراو
٥- چەکی دژە تانک (**Javelin**)

**گرنگ**

١- چەکی دژە فڕۆکە (وەک **Stinger**)
٢- مین (**Claymore**)
٣- چەکی نیشانەشکێن (**Sniper**) وەک زاگرۆ
٤- چەکی ئاسایی
٥- مینی دژە تانک
٦- سوتەمەنی
٧- درۆن

# ژمارەت هەیە و خاڵی بەهێزت زیاترە

بەرگریکەری ناو شار کە ئامادەیی شەڕیان هەیە خاڵی بەهێزیان هەیە بەسەر هێرشکەرەکانەوە. لە ساڵی ٢٠١٦، زیاتر لە ١٠٠،٠٠٠ کەسی ویست بۆ ئەوەی شاری موسڵ بگرن بەرامبەر ٥،٠٠٠ بۆ ١٠،٠٠٠ چەکداری داعش، لە جەنگی ستالینگراد، ئەڵمانەکان بە دەیان هەزار سەربازەوە هێرشیان بردبووە سەر ستالینگراد و لە کۆتایی تێکشکا هێرشەکەیان. ڕێبازی سەربازی دەڵێت کە هێرشکەر پێویستی بە ٣ بۆ ٥ ئەوەندە سەربازی زیاترە بۆ هێرشبردنە سەر شار وەک لە هێرش بردنە سەر ناوچەیەکی تاخت یان دارین، بۆیە بۆ هێرشبردنە سەر شارەکە، دوژمن دەکرێت پێویستی بە ٥ ئەوەندە سەرباز بێت بەرامبەر هەر یەک کەسی بەرگریکەرەکان.

**چەند بەرگریکەرێک ئامادەکاریان کردبێت دەتوانن شارێک بگرن بەرامبەر ژمارەیەکی زۆر لە هێرشکەر**



# هێزی بەرگری شار هەموو شتێکی دەوروبەری بەکاردەهێنێت

بەرگریکەر لە جێگاکانی ناوشار شارەزایە، شاری خۆیانە، سەرچاوەی هێزیانە، هەموو لایەنێکی بەکاردەهێنن، هەموو کوچ و کۆڵانێک، هەموو تەلارێکی بەرز و چیمەنتۆ و بەرز و نزمی و ژێرزەمین و تونێل، ملیۆنەها جێگای خۆشاردنەوە و تەقەکردنی تیادایە.




Introduction Figure-1. Multidimensional urban environment

# بەرگری و خۆپاراستن

بە مردووی ناتوانی شەڕکەی.

جێگای شەڕکردنەکەت بە شێوەیەک ڕێکبخە کە زۆرترین پاراستنت باتێت کاتێک دوژمن هێرش دەبات.

سێ قۆناغ هەیە بۆ هێرشی دوژمن.

هێزی بەرگری شار پێویستە ئامادە بێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەموو سێ قۆناغەکە.

# قۆناغی یەکەمی هێرشی دوژمن

یەکەمین قۆناغی هێرشی دوژمن بۆمبارانکردنی ئەو جێگایانەیە کە زانیارییان لەسەری هەیە (واتە ئەو شوێنانەی کە پێشوەخت زانیویانە یان لە ئاسمانەوە دەبینرێن)، ئەم بۆمبارانە دەکرێت بۆ بێهێزکردنی بەرگرییەکانی شارەکە و بۆ شکاندنی ورەی هێزەکانی بەرگری لە شارەکە دەکەن، لەم قۆناغەدا پێویستە هەموو کاربکرێت بۆ شاردنەوەی ناوچەی شەڕکردن و شوێنە هەستیارەکان، هەروەها هێزەکانی بەرگری پێویستە بزانن لە کوێوە دەربازبن (ئەمە بینای پتەو بێت یان ژێرزەمین) و دوایی لە کوێوە بتوانن بێنەوە دەرەوە بۆ شەڕکردن: ئەمە سەرەکییە.



# قۆناغیٚ دووەمی هێرشی دوژمن

قۆناغیٚ دووەم، بەرەبەرە کە هێرشکەرەکە نزیکتر دەبێتەوە لە شارەکە، دەست ئەکەن بە بۆمبارانی چڕی سەر هەموو بیناکانی ناو شارەکە، بەو ئاواتەوە کە هێزی بەرگری شارەکە خۆیان بەن بەدەستەوە، ئیتر ئەم بۆمبارانکردنە ئەکریٚ چەندین و ڕۆژ یان چەندین هەفتە بخایەنێت، لەم قۆناغەدایە کە ژێرزەمینەکە گرنگییەکی زۆر دەبینێت و خۆپاراستن و هەروەها پاراستنی پێداویستی و چەکەکان، هێزی بەرگری پێویستە بەردەوام ئاگادار بن لە جێگای دوژمن کاتێک هێرشکەرەکان بەرەو شارەکە دەڕۆن و نزیکدەبنەوە.



# قۆناغی سێیەمی هێرشی دوژمن

قۆناغی دوای ئەوە تەقەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەبێت کاتێک بەرەبەرە دوژمن نزیکدەبنەوە لە سنوورەکانی شارەکە و هەوڵ دەدەن بچنە ناو شارەکەوە، ئەمە قۆناغێکی مەترسیدارە، چونکە لێرەدا هێزی بەرگری پێویستە بتوانێت هەم لە دوژمن بدات و هەم بتوانێ خۆی بە بپارێزێ لە تەقەی ئەوان، لێرەدا هێزی بەرگری دەتوانێ نزیک بێتەوە لە هێرشکەرەکان بۆ ئەوەی چیتر هێرشکەرەکان نەتوانن تۆپهاوێژەکانیان بەکاربێنن لە ترسی ئەوەی سەربازی خۆیان بکوژن.

داروبەردی ڕوخاوی قۆناغەکانی پێشوو جێگای باشن بۆ ئەوەی لێوەی بجەنگی.



# له هەموو کاتێکدا شاراوەبە!

پێویستە شاراوە بمێنیتەوە، ئەگەر ببینرێیت ئەوە واتە دەکرێ بە موشەک و بۆمب و تۆپ و هاوەن لێت بدرێت، بەتانی و دار و پلاستیک و تەنەکە و یان هار شتێکی تر بێت بەکاری بێنە لە نێو بینا و لە سەرەوەی بیناکاندا بۆ ئەوەی لە سەرەوە و خوارەوەش نەبینرێێت و جێگاکەت شاراوە بێت، هەموو شتێک بشارەوە





# ژێر زەمین بەکاربێنە!

ژێرزەمینەکان بەردەوام کەرەستەیەکی زۆر بەهێزی جەنگی ناوشار بوون، ڕێگە بە هێزی بەرگری دەدەن کە لە بۆمب دەربازبن، شەڕڤان و پێداویستی بشارنەوە و بپارێزن، هەروەها بۆ ئەوەی بە شاراوەیی بجوڵێن و لە هێرشکەر بدەن.

**ژێر زەوی باشترین هاوڕێی هێزی بەرگرییە**








Stalingrad, Vietnam, Grozny



ئەگەر هیچ ژێرزەمینێک نەبێت، ئەوە دەست ئەکەی بە هەڵکەنین، تیمێک خەڵکی سیڤیل دەتوانن تەنیا لە چەند ڕۆژێکدا تونێلێکی قوڵ و درێژ هەڵکەنن، شوێنی خۆپاراستن لە بۆمب و ڕاڕەوی ژێر بینا هەڵکۆڵن، لەگەڵ جێگای پارێزراو بۆ ئازوقەکردن.

# دەروازەکانی قەڵاکە داخە

بیر لە شار یان شارۆچکەکەت بکەرەوە وەک قەڵایەک.

پێویستە هەموو ڕێگایەک بۆ ناو قەڵاکە بگریت.

هەموو ڕێگا و کوچ و کۆڵانێک بۆ ناو و دەرەوەی شارەکە بگرە.

پردەکان و فڕۆکەخانەکان و شوێنە تەختە کراوەکان یان بڕوخێنە یان بگرە، ئەو شوێنانەی کە سەرباز پێویست بێت بڕۆن بۆی بە هەلیکۆپتەر یان پەڕەشووت یان فڕۆکە یان زیلی سەربازی یان بە پێ.

شێوەی ژینگەی ناو شارەکە بگۆڕە بە شێوەیەک کە دوژمن ناچاربکەی بچنە ئەو ناوچانەوە کە بتوانی تێیدا بڵاویانبکەیتەوە و بیانکەیتە تیمی بچوک بۆ ئەوەی ئاسانتر لەناویانبەریت.

# چەند چینێک لە بەربەست

ناوشار پێویستە بە شێوەیەک بگونجێنرێت کە بتوانێت هێزی هێرشکەر خاو بکاتەوە یان بووەستێنێ بۆ ئەوەی لێیان بدرێت، ناچاریان بکە بە نێو داوەکانتا بڕۆن، ڕێگرەیان لێبگرە بێنە ناوچەکانی شارەکەوە.

چەندین هێڵی بەرگری دروستبکە، بازنەی تەواو لە دەوری شارەکە ئامادەبکە، بەربەست دروستبکە، چین لە دوای چین کۆسپ دابنێ، خێرایی واتە ئاسایش، زیلێکی خاو یان سەربازێکی پیادەی خاو ئاسانترە لێی بدرێت.



- سی خولەک بۆ ناوەندەکە
- بە خێرایی بەرەو ئامانجەکە
- چەندین بەربەست
- سووتەمەنی زیاتر بەکارەهێنێت
- خاو = ئاسانترە بەرەو ئامانجەکە
- هێڵی بەرگری
- پێش هەر یەکتربڕینێک





چۆن بەربەست دروست بکەیت (ئوتومبێل دەتوانێ پێیدا تێپەڕێت)



# بەردەوام بەرگری خۆت بەهێز بکە

لە هەر بەرگرییەکی شاردا، بەردەوام پێویستە لە خۆ ئامادەکردندا بیت بۆ هێرشی دوژمن.

تەنانەت لە کاتی شەڕکردنیشدا بەردەوامبە لە بەهێزکردنی جێگاکەت، هەندێک کەس دەتوانن بجەنگن و لەهەمان کاتدا ئەوانەی تر جێگاکەیان بەهێزتر بکەن، دامەنیشە بە بێکاری و لە کراوەیا مەوەستە! لە نزیک خاڵەکانی پشکنین سەنگەر لێبدەن، تونێل هەڵکەنن!



سەنگەر و چاڵ و حەشارگە و تونێل

# فڕۆکەخانەکان یان بگرە یان بڕووخێنە

شوێنی سەرەکی لە ناو شاردا کە هێزی دوژمن بیانەوێت بە خێرایی بیگرن فڕۆکەخانەکانن، دوژمن دەیەوێت بە خێرایی فڕۆکەخانەکان بگرن بۆ ئەوەی لەوێوە بتوانن هێرشی ئاسمانی بنێرن و هێرش بەری زیاتر بنێرن.

هێزی بەرگری دەبێت هەموو فڕۆکەخانەکان بگرن، بۆ ئەم مەبەستە، گەورەترین و گرانترین ئوتومبێلەکانتان لەسەر باڕەوەکان(هێڵی فڕۆکەکان) دابنێن (وەک ئەو وێنەیەی خوارەوە)، باتری و کلیلی ئوتومبێلەکان بەرن لەگەڵ خۆتان، ئەگەر کاتتان هەبوو ئەوە باڕەوەکان هەڵکۆڵن.



# بەندەرەکان یان بگرن یان بڕوخێنن

زۆرینەی شارەکانی جیهان یان لەسەر ئاوەڕێن یان دەریا، ئاوەڕێ و ڕووبار و دەریا و کەنار و بەندەرەکان هەمووی شوێنی سەرەکین کە دوژمن بیانەوێ داگیری بکەن بە خێرایی لە شاردا.

ڕێگەی گرتنی بەندەرەکان بگرن، جێی نیشتنەوەی کەشتییەکان بڕوخێنن.

لە ناو ئاو و ڕۆخی ئاوەکان یان بەندەرەکان بەربەست دابنێن بۆ ئەوەی ڕێگە بگرن لە کەشتی سەربازی.

هێزی بەرگری ئەتوانن لەم ناوچانە کەشتییەکان بڕوخێنن.

چەک دانێن و سەنگەر لێبەن بۆ بەرگری کردن لە بەندەر و ڕۆخەکان.



# پردەکان یان بگرن یان بڕوخێنن

دوژمن دەیانەوێت بە خێراترین شێوە بڕۆنە ناو شارەکانەوە، زیلی سەربازی پێویستە پرد بەکاربێنن، زۆرینەی هێزە سەربازییەکانی جیهان ڕێگەی تریان نییە بێجگە لە پرد بۆ پەڕینەوەی ڕووبار، ئەگەر هێزی بەرگری شار پردەکان بگرن بە بەربەست یان بڕوخێنن ئەوە هێرشی دوژمن دەوەستێنێ.



# هەموو ڕێگایەک بۆ ناو شارەکە بگرە

برۆ دەرەوە و بەربەست دروستبکە لەسەر شەقامەکان! ئەگەر پردێک هەبێت کە نەڕووخێنراوە لەوێوە دەستپێبکە، بە پاس و لۆری و ئوتومبێل و چیمەنتۆ و دار و خۆڵ و خاشاک و یا هەرشتێک بێت ڕێگاکە بگرە، پاشان هەر جێیەکی باریک و تەسک هەبێت لە نێوان دوو بینای بەرزدا لە شارەکەیا بێت دایبخە، هەموو کوچ و کۆڵانەکان!






# هەموو دەرگا و پلیکانەکان بگرە

تا لە تواناتا هەیە، دەرگا و پلیکانەی خانووەکان بگرە، بەتایبەتی گەر ئەو خانوانە ببن بە شوێنی جەنگ، کەلووپەلی ناوماڵ و تەلبەند و خۆڵ و هەموو شتێک بەکاربێنە بۆ گرتنی ئەم شوێنانە.

دوژمن هەوڵ دەدەن لە ڕێی دەرگاکانەوە بێنە ناو خانوەکانەوە، ئەو هەلەیان مەیەرێ کە دەرگاکان بەکاربهێنن.



# هەموو ئۆتومبێلێک یان خاو بکەرەوە یان بووەستێنە

هەموو ئۆتومبێلێکی سەربازی بووەستێنە یان خاو بکەرەوە کە بە ناوچەکەتا دەیانەوێ بڕۆن، ئەمە بە گرتنی شەقامەکان دەکرێت، ئۆتومبێلەکان خاوبکەرەوە بۆ ئەوەی بتوانی تەقەیان لێبکەی یان مۆلۆتۆڤیان تێبگریت.

بەربەست لە جادەی هەموو شار و شارۆچکەکان دابنێ بۆ ئەوەی دوژمن خاوبکەیتەوە و بەنزینی زیاتریان پێ بسووتێنی و هەروەها بیانکەیتە ئامانجی ئاسانتر.

ئەگەر دوژمن لە بەربەستێک بووەستێ، دەرگاکانی ئۆتومبێلەکەیان بکەنەوە و بێنە دەرەوە، ئەوە ئەبنە ئامانجی ئاسان.



# بەربەستەکان

هێزی بەرگری شار پێویستە هەموو کەرەستەکانی ناو شارەکە بەکاربێنێت بۆ دروستکردنی بەربەست بۆ دوژمن.

باشترین بەربەستەکان ئەوانەن کە هێزی بەرگری بتوانن لە پشتیەوە تەقە بکەن، ئیتر ئەو تەقەیە تەقەی ناڕاستەوخۆ بێت وەک هاوەن، یان ڕاستەوخۆ بێت وەک دۆشکە و تفەنگ.

بەربەست بۆ زۆر شت بەکاردێن وەک:

- تەواو گرتنی جادە یان ناوچەیەک یان ڕێگایەک.
- خاوکردنەوەی دوژمن
- ناچارکردنی دوژمن بۆ ئەوەی لە ئوتومبێلەکانیان بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی بکرێنە ئامانج.
- کات بگەڕێننەوە بۆ هێزی بەرگری.

# بەربەستی وا دروستبکە کە هەموو شتێک بووەستێنن

ئەو بەربەستانە بەکار بێنە کە پێشوەخت هەبوون، شاری ئێستا زۆرجار بەربەستیان تیایە کە لە چیمەنتۆ دروستکراون، ئیتر ئەمانە بەکاردێن بۆ خاڵی پشکنین و پاراستنی هەندێک شوێن بۆ ئوتومبێل، ئەم بەربەستانە زۆر باشن بۆ ئەوەی ڕۆڵی بەربەست ببینن لە جەنگدا، لەگەڵ ئەمەشدا شیشە پۆڵاییینەکانیش باشن کە هەمان کاریان هەیە لە ناو شاردا.





# بەهێزترین ماددەکان بەکاربێنە

پێویستە شارەکە بکەیتە قەڵایەک و دەروازەکانی دابخەیت، هەموو شەقام و جێێ پەڕینەوە و کۆڵان و دەرگا و پەنجەرەی نهۆمی یەکەمە دایخەیت، ئەو ماددانە بەکاربێنە کە لە ناو شارەکان بەکارهاتوون، وەک چیمەنتۆ، ئەوانە بەهێزیترینن و زۆرتین پاراستنت پێدەبەخشن.

چێمەنتۆ و ماددەی خانوو و بینا دروستکردن باشترین بەرگرین.



# بەکارهێنانی ئۆتومبێل

ژینگەی ناو شار پڕیەتی لە چەندەها جۆری جیاواز لە ئۆتومبێل، گرانترین و گەورەترین و پتەوترینیان بەکاربێنە بۆ مەبەستی خۆت، هەر جۆرێک ئۆتومبێل بێت، ئۆتومبێل بەربەستی زۆر باشن، بیانبە لە جادەکان و کۆڵانەکان دایاننێ، لە فڕۆکەخانەکان دایاننێ وەک بەربەست، ئۆتومبێلی ئاسایی و پاس و خۆڵ و خاشاک و بیناسازی بەکاربێنە.



# چیمەنتۆی پتەوکراو بە پۆڵا بەکاربێنە

چیمەنتۆ ماددەی سەرەکی بەرگرییە، هێزی بەرگری ناو شار ماددەی تایبەت بەکارەهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، چیمەنتۆی پتەوکراو بە شیشی پۆڵاین دە ئەوەندە جار باشترە لە گوێنیی لم، بەرد و خشت بەکاربێنە.





چیمەنتۆی پتەوکراو بە شیشی پۆڵاین





گوێنیی لم

# ورده بەرد و ورده خشت بەکاربێنە

ورده خشت و بەرد پەیدا بکە بە ڕوخاندنی خانوو و بیناکان، لێوەی دەتوانن کەرەستەی پتەوی لێ پەیدابکەن وەک چیمەنتۆ و بەرد و خشت و ماددەی پتەوی تر.



# ئاو بەکاربێنە

ڕووبار و زەلکاو و دەریاچە بەربەستی زۆر باشن و ڕێگای خێرای گواستنەوەن بۆ هێزی بەرگری، وەک چۆن باسمان کرد لە بەشی ڕووخاندنی پرد، زیلی سەربازی بێ پرد زۆر ئەستەم لە بەربەستی ئاویی دەپەڕنەوە.

بێجگە لەو ئاوانەی بە شێوەی سرووشتی هەن، ئاو دەکرێ بۆ ناوچەی دەوروبەری شار دابنرێن بۆ دروستکردنی ناوچەی قوڕاو، ئەم ناوچانە زیلی سەربازی ناتوانن پێیدا تێپەڕن، ئەمە وەک کەندێکی هاوچەرخ وایە بۆ قەڵا هاوچەرخەکەت.

کاتێک هێزەکانی ڕووسیا دەستیان کرد بە داگیرکردنی ئۆکرانیا لە مانگی دووی ٢٠٢٢، ئۆکرانیا سێ ڕووباری دەوروبەری شاری (کیڤ)یان پڕ کرد لە ئاو لە ڕێگەی کردنەوەی کەنداوەکانەوە بۆ ئەوەی ئاستی ڕووبارەکان بەرزبکەنەوە و بیانکەنە بەربەستی قووڵ و بەهێز بەرامبەر هێزەکانی ڕووسیا، ئۆکرانییەکان تەنانەت ڕووبارێکیان کردەوە بۆ ناوچەیەکی زۆر گەورە کە ئەچووەوە سەر شارەکە، ئەوە بەربەستێکی گەورەی دانا بۆ هێزی ڕووسەکان.



# پەرژین بەکاربهێنە

ئەگەر پەرژین لەبەردەستدا هەیە، بەکاری بهێنا، بیانخەرە سەریەکتری، لە نێوان بیناکاندا دایبنێ، پەرژینێکی سێ تاڵیی تیژ دەتوانن زۆر ئوتومبێلی سەربازی بووەستێنن، تەنانەت دەتوانن تانکێک خاو بکەنەوە لە جوڵە.






# کەند و چاڵی دژە تانک هەڵکۆڵە

ئەگەر کاتت هەبوو و کەرەستەی هەڵکەنینت هەبوو ئەوە چاڵ هەڵکەنە و لە دەوری چڕترین بەشەکانی شارەکە بەربەستێک دابنێ، بەتایبەتی هەر جێیەکی چوونە ژوورەوە بێت کە دەتوانی بیگری بێ ئەوەی زیان بە داواکاریی و ویستی خەڵکی سیڤیل بگەیەنیت، لێرەدا ئامانجەکە ئەوەیە کە ناوچە چڕەکانی شارەکە زیاتر چڕ بکەی.





# بەربەستی شێوە (S) یان پێچاوپێچ دروست بکەن

ئەگەر شەقامێک هەبێت کە هێشتا دەتەوێ بەکاریبێنیت، ئەوە بەربەستەکان بە شێوەی پێچاوپێچ دابنێ بۆ ئەوەی هەم بتوانی بەکاریبێنیت و هەم دوژمنیش خاوبکەنەوە، بیر لە خاڵی پشکنینی پۆلیس بکەرەوە، دەتوانی خاڵی پشکنینیش دابنێیت بۆ ئەوەی پێش ئەوەی هێرشکەر بگەنە شارەکە بتوانی تێکدەرەکان بگریت، نابێت لە ناو شارەکەدا هیچ شەقامێک هەبێت کە ڕێگە بە دوژمن بدات بە خێرایی و بە ئاسانی پێیدا تێپەڕیت.



# ژیشکی پۆڵایین

ئەم شێوە ژیشکە پۆڵایینانە بەربەستێکی پتەون کە لە سێ پارچە ئاسن دروسکراون کە درێژییان ١٢٠ سانتیمە و گۆشەیان ٤ بە ٤ە، بۆ ئەوە دروستکراون کە لە ژێر ئوتومبێلا بسوورێنەوە و بیانوەستێنن، ئەمانە بە ئاسن لەحیم دەکرێن لەو بەشەیدا کە سێ پارچە ئاسنەکە دەلکێن پێکەوە.



# دڕکەزی ئاسنین

ئاسنی شێوە ژیشکی بچوکتر هەن وەک دڕکەزی وان، کۆتاییەکانیان تیژە و دەکرێ بە زنجیر پێکەوە بلکێندرێن و فڕێبدرێن و لە جادە و ڕێگاکان دابنرێن بۆ خاوکردنەوە و وەستاندنی ئۆتومبێلی دوژمن، لەو ڕێگایانە باشە دانانی کە دەتەوێ بیکەیتەوە و دایخەیت بە پێی ویستی خۆت.

ئەم دڕکەزییانە بەربەستی چوار-لان و تایەی ئۆتومبێلی سەربازی دەتەقێنن، ئەمانە بەرامبەر زیلی سەربازی و سەربازی پیادە زۆر کاریگەرن، دڕکەزییەکی نموونەیی نزیکەی ٥٠ سانتیم درێژن و چێوەکەیان ٤ سانتیم دەبێت، هەردوو لایان تیژکراوەتەوە و بە گۆشەی ١٢٠ پلە لە ناوەڕاستەکەیاندا چەماونەتەوە و ناوەڕستاکەیان لەحیمکراوە، ئەمانە دۆزینەوەیان ئەستەمە بۆ دوژمن.





# کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن

هێزی بەرگری دەکرێ توانای بەرەنگاربوونەوەی نەبێت بەڵام دەتوانن لە ڕێگای ترەوە یارمەتی هێزی بەرگری بدەن، ئەوەش لەڕێگەی کۆکردنەوەی زانیارییەوەیە لەسەر جووڵە و ناونیشان و چالاکی دوژمن.

# ڕێگایەک بۆ کۆکردنەوەی زانیاری

چەندەها شێوازی جیاواز هەن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن، گرنگترین شێواز ئەوەیە کە بە زووترین کات زۆرترین زانیاری بدات بەدەستەوە، بە شێوەیەکی پوخت و ورد، شێوازێکی سەربازی باو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن ئەم شێوەیەیە: قەبارە- چالاکی- ناونیشان- یەکە- کات- کەلووپەلی سەربازی (قچنیکک):

**قەبارە/کێ** – ئەمەیان بە ژمارە و پۆل یان قەبارە دەردەبڕی، بۆ نموونە دەڵێیت "١٠ سەربازی پیادە" نەک "پۆلێک پیادە".
**چالاکی/ چی** – چی دەکەن ئەوانەی زانیارییان لەسەر کۆدەکەیتەوە، بۆ نموونە دەڵێیت "مین لەسەر جادەکە دەنێژن".
**ناونیشان** – ئەمە ناونیشانی سەربازی بەکاردێنیت (وەک ئەوەی خشتەکە).
**یەکە/پۆل/کێ** – ناو یان زانیاری تر بۆ ناسینەوە، وەک باجی سەر پۆشاک یان نیشانەی سەر ئۆتومبێل.
**کات** – ئەو کاتەی کە چالاکییەکەت بینی، نەک ئەو کاتەی کە زانیارییەکەت نووسی.
**کەلووپەل** – زانیاری دەربارەی ئەو کەلووپەلانەی لە چالاکییەکەدا بوون و ئەو تاکتیکانەی بەکارهێنراون.

| | |
|---|---|
| **قەبارە** | حەوت سەربازی دوژمن |
| **چالاکی** | بەرەو باشووری ڕۆئاوا دەڕۆن |
| **ناونیشان** | GA123456 |
| **یەکە** | پۆشاکی سەربازی ڕەنگ زەیتوونی بە شەش ئەستێرەوە لەسەر شانی چەپ. |
| **کات** | ٢١٠٢٠٠ مانگی یەک ١٦ (واتە ٢١:٠٢:٠٠) |
| **کەلووپەل** | یەک دۆشکە و یەک ئاڕپیجی. |

# زانیاری کۆکردنەوە بە سەلامەتی

زۆر گرنگە ئەوە بزانیت تەنانەت کەسێکی سیڤیلیش کە زانیاری کۆدەکاتەوە لەسەر دوژمن دەکرێنە ئامانج لە لایەن دوژمنەوە، دەکرێت لە کاتی زانیاری کۆکردنەوەدا بکرێنە ئامانج.

کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن پێویستە بە شێوەیەکی سەلامەت بکرێ.

کۆکردنەوەی زانیاری ئەلیکترۆنی وەک وێنە و ڤیدیۆ بە مۆبایل دەبێت بە شێوەیەکی سەلامەت بکرێت:

- هەموو خزمەتگوزارییەکی جی پی ئێس نەخشە) بکووژێنەرەوە لە مۆبایلەکەت.
- هەرگیز مەچۆرە سەر تۆڕێکی کۆمەڵایەتی گشتی چونکە ئەم تۆڕانە دەکرێت لە ڕێیەوە ناونیشانەکەت دیاری بکرێت و زانیاری لەسەر هێزی بەرگری پەیدا بکەن.
- ئەگەر وێنە یان ڤیدیۆ بگریت و بیدەیت بە کەسی تر، ئەوە دوای ئەوە دڵنیابەرەوە دوای ئەوە بیسڕیتەوە لە مۆبایلەکەی خۆتا، هەروەها هەموو نامەکانی مۆبایلەکەت بسڕەوە کە زانیاری لەسەر هێزی بەرگری بدەن بەدەستەوە.





# چەک

هێزی بەرگری شار هەموو چەکێک بەکاردەهێنن کە لەبەردەستدان یان دەتوانن دروستیکەن، کاتێک دوژمن دێنە هێڵی بەرگرییەکەتەوە و سەرکەوتوو دەبن، ئەوە هەلی ئەوەت دەداتێ کە دەست بەسەر چەکەکانیان بگریت و بەکاریانبهێنیت.

# بنەمای گشتی بۆ سەلامەتی چەک

لەگەڵ هەموو چەکێکدا بە شێوەیەک هەڵسووکەوت بکە وەک ئەوەی پڕبێت لە فیشەک.

لەگەڵ هەموو چەکێک بە هۆشداری هەڵسوکەوت بکە، فڕێی مەدە، وەک گۆچان بەکاری مەهێنە و لە گڵ و قوڕاودا دایمەنێ.

نیشانە مەگرەوە ئەگەر ناتەوێ تەقە بکەی.

هەمیشە ئامانجەکەت دیاریبکە پێش تەقە کردن.

هەمیشە چەکەکەت لە باری سەلامەتیدا بهێڵەرەوە، بێجگە لەو کاتەی تەقەی پێ دەکەیت.

پەنجەت لەسەر شوێنی تەقەکردنەکە دامەنێ ئەگەر نیشانەت نەگرتۆتەوە بۆ تەقەکردن.





# بنەمای گشتی بۆ پاراستن و ئاگاداری چەک

چەکەکانت بە پاکی بهێڵەرەوە، لە ژەنگ و قوڕ و گڵ و کاربۆن و ماددەی پیسی تر بیپارێزە.

هەموو ڕۆژێک چەکەکەت پاککەرەوە!

بە پەڕۆیەک پاکی کەرەوە و ماددەیەکی چەورکردن بەکاربێنە بۆ بەشەکانی کە ئەجووڵێنەوە

چەکی پیس دەبێتە هۆی تێکچوون، ئەکرێ ئەو تێکچوونە لە کاتی جەنگیشدا بێت.



# تایبەتمەندییەکانی کلاشینکۆڤ (AK-47)



| کلاشینکۆڤ | |
|---|---|
| جۆر - قەبارە | ٧.٦٢*٣٩ میلیمەتر |
| بارستایی (کاتێک گولەی تیانییە) | نزیکەی ٣.٣٩ کیلۆگرام |
| درێژی:<br>بە قۆناغەوە<br>بێ قۆناغ | <br>نزیکەی ٨٦.٨٧ سانتیمەتر<br>نزیکەی ٦٨.٥ سانتیمەتر |
| کەندەکەکانی ناو لوولەکە | ٤ کەندەکی هەیە، بە دەستە ڕاستدا دەسووڕێت<br>١ سووڕان لە ٣٥ سانتیمدا |
| خێرایی مەزڵ (لووتەکەی) | نزیکەی ٧١٥ مەتر لە چرکەیەکدا |
| ڕێژەی تەقەکردن | ١٥/١٢ گولە لە خولەکێکدا |
| مەودا | ٤٠٠ مەتر |
| شێوازی تەقەکردن | سەیف، ئۆتۆماتیک، سیمی-ئۆتۆماتیک |
| نیشانە:<br>پێشەوە:<br><br>پشتەوە: | <br>نیشانەی پێشەوەی دەگۆڕدرێت بۆ بەرزکردنەوە<br>نیشانەی هەوا دەگۆڕدرێت<br>نیشانەی لیف سایت |
| مەخزەن | ٣٠ فیشەک |

# کڵاشینکۆف

بەشی چەپی تفەنگەکە ئەم بەشانە دەردەخات: دەمی تفەنگ، لوولەی تفەنگ، لووله(بۆری گاز)، سەرقاپی تفەنگ، دەسکی لێکردنەوەی مەخزەن، و دەسکی گرتنی تفەنگ:




وێنەی تفەنگی کڵاشینکۆف لە لای چەپەوە

بەشی ڕاستی تفەنگەکە ئەم بەشانە دەردەخات: قۆناغ، قفڵی سپرینگ، دەسکی هەڵبژاردن، دەسکی گۆڕینی مەخزەن، نیشانەی دوواوە، نیشانەی پێشەوە، سەرەڕم، دەسکی تەقەکردن، پەتی تفەنگ:




وێنەی کڵاشینکۆف لە لای ڕاستەوە

# کڵاشینکۆڤ

بەشە سەرەکییەکان:




بەشە سەرەکییەکانی کڵاشینکۆڤ

1. **<u>جێگای مەخزەن و لوولەی تفەنگ:</u>** ئەم بەشە نیشانەی پێشەوە و لوولەی گاز و جێگای گرتنی گاز و نیشانەی پشتەوە و شوێنی گۆڕینی تفەنگ بۆ ئۆتۆماتیک و سپرینگەکەی، لەگەڵ جێگەی چەکوشی تفەنگ و دەسکی لێکردنەوەی مەخزەن و دەسکی هەڵبژاردن و دەسکی تەقەکردن و دەسکی گرتن و قۆناغ.
2. **<u>قەپاغی سەرەوە:</u>** قەپاغی سەرەوە بەشەکانی ناو خاڵی یەکەم دەپارێزێت.
3. **<u>سپرینگی کشانەوەی تفەنگ و تووڵی ڕێنیشاندەر:</u>** سپرینگی کشانەوە و تووڵی ڕێنیشاندەر هەڵگری بڕغوەکە دەگەڕێننەوە بۆ شوێنە جێگیرەکەی خۆی لە کاتی سووڕی کشانەوەی پێچەوانەی تفەنگ.
4. **<u>جێگای برغوو و هەڵگری برغوو:</u>** چەند بەشێک لە خۆ دەگرێت وەک دەسکی فیشەک هەڵگرتن و پستۆنی گاز و هەڵگری برغوو بەشەکانی برغووەکە، کە لە برغووەکە و دەرزی و دەرهێنەر و سپرینگی دەرهێنەر و دەرزی تەقەکردن و دەرزی هێشتنەوەی دەرزی تەقەکردن پێکهاتووە، ئەمە بەردەوامی بە جووڵەی درووستی تفەنگەکە دەدات.
5. **<u>مەخزەن(کۆگا):</u>** مەخزەنەکە دەکرێ لە کانزا یان پلاستیک دروستکرابێت، توانای هەڵگرتنی ٣٠ فیشەکی هەیە و بە جێی مەخزەنەوە دەکرێت، بە پارچەیەکی مەخزەنەکە دەبەسترێت بە تفەنگەکەوە، جووڵەی پێشەوەی هەڵگری برغوەکە فیشەک لە مەخزەنەکە دەردەکات و دەیخاتە لوولەی تەقەکردنەوە.

# کڵاشینکۆڤ لە بارە جیاوازەکانیدا

**باری سەلامەت(سەیف):** چەکەکە لەم بارەدا تەقە ناکات، پێویستە دەسکەکە لابەریت لەسەر ئەم بارە بۆ ئەوەی فیشەک بچێتە لوولەکەوە یان بۆ ئەوەی فیشەک بتەقێنی، بەردەوام لە کاتی تێکردن و لابردنی مەخزەندا دەسکەکە بخە سەر ئەم باری سەلامەتە، دەتوانی تفەنگەکە بخەیتە ئەم بارە تەنانەت کاتێک چەکووشی تفەنگەکە لە پێشەوەیە، وێنەکەی خوارەوە ببینە:



کاتێک دەسکی هەڵبژاردن دەخەیتە سەر باری سەلامەت

**باری سیمی(نیمچە) ئۆتۆماتیک:** لەم بارەدا تفەنگەکە دانە دانە تەقە دەکات، واتە بۆ هەر فیشەکێک پێویستە دەسکی تەقەکردنەکە داگریت، وێنەی خوارەوە ببینە:



کاتێک لەسەر سیمی(نیمچە) ئۆتۆماتیک دادەنرێت

**باری ئۆتۆماتیک:** لەم بارەدا تفەنگەکە بەردەوام تەقەدەکات کاتێک پەنجەت لەسەر دەسکی تەقەکردنەکە دادەنێیت تاوەکوو پەنجەت لادەبەیت یان تاوەکوو مەخزەنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، وێنەکەی خوارەوە ببینە:



کاتێک لەسەر سیمی(نیمچە) ئۆتۆماتیک دادەنرێت

# کڵاشینکۆڤ (مەخزەن گۆڕین)

## ئاگاداری

ئەگەر چەکەکە بکەویت کاتێک مەخزەنەکەی پڕە، دەکریت تەقە بکات، ئاگاداری ئەم خاڵە بە چونکە دەکرێت ببێتە هۆی برین و مردن بۆ هەڤاڵەکانت.

## ئاگاداری

هەرگیز خۆت دەسکی بارکردنەوە بۆ پێشەوە مەجووڵێنە، ڕێگەی پێ بدە خۆی بجووڵێتە پێشەوە.

........................................................................................................................................

١. دەسکی هەڵبژاردن بکەرە سەر باری سەلامەتی.

٢. دەمی مەخزەنەکە بخەرە ناو جێی مەخزەنەکەوە و مەخزەنەکە بە پێچەوانەی میلی کاتژمێر بسووڕێنە بۆ ناو جێی مەخزەنەکە تاوەکوو گوێت لە دەنگی قرتەکە دەبێت، ئەم دەنگە بە واتای ئەوە دێت کە مەخزەنەکە جێگیر بووە لە شوێنی خۆیدا، پاڵ بە مەخزەنەکەوە بنێ و ڕایکێشە، سەرەوە و خوارەوە بۆ ئەوەی دڵنیابیتەوە کە بە باشی جێگیرە.




تێکردنی مەخزەن

٣. دەسکی هەڵبژاردن بخەرە سەر باری سیمی(نیمچە) ئۆتۆماتیک.

٤. دەسکی بارکردنەوە داگرە بۆ ئەوەی فیشەکەکە ئامادە بکەیت بۆ تەقەکردن، دەسکەکە بەرەو پێشەوە مەبە بە دەستی خۆت، وەک چۆن لە سەرەوە باسمان کرد.

٥. دەسکی هەڵبژاردنەکە بخە سەر باری سەلامەتی (سەیف)

# کڵاشینکۆڤ (مەخزەن لێکردنەوە)

١. چەکەکە ئاڕاستەی ناوچەیەکی سەلامەت بکە و دەسکی هەڵبژاردنەکە بخە سەر باری سەلامەتی.

٢. بۆ لێکردنەوەی مەخزەنەکە، دەسکی لێکردنەوەی مەخزەنەکە داگرە خوارەوە و مەخزەنەکە بە ئاڕاستەی میلی کاتژمێر بسووڕێنەوە و بۆ پێشەوە.



لێکردنەوەی مەخزەن

٣. دەسکی هەڵبژاردن بخەرە سەر باری سیمی(نیمچە) ئۆتۆماتیک یان ئۆتۆماتیک، وێنەکەی خوارەوە ببینە:



دانانی دەسکی هەڵبژاردن لەسەر سیمی یان ئۆتۆماتیک

٤. دەسکی بارکردنەوە ڕاکێشە بۆ دواوە و بەو شێوەیە بیهێڵەرەوە.

٥. بە بینین و دەست لێدان پشکنین بکە بۆ جێی وەگرتنی فیشەک و ریسیڤەر بۆ ئەوەی دڵنیابیتەوە کە فیشەکیان تیا نییە.

٦. دەسکی بارکردنەوەکە بەردە و ڕێگەی پێ بدە بگەڕێتەوە جێگە ئاساییەکەی خۆی، بیخە سەر باری سەلامەتی.

٧. ئێستا چەکەکەت بەتاڵ و سەلامەتە.

# کڵاشینکۆڤ(گۆڕینی نیشانە)

**نیشانەی پێشەوە:**

<u>ستوونی نیشانەی پێشەوە:</u> ستوونی نیشانەی پیشەوە بەریتە خوارەوە ئەوە پیاکێشانی فیشەکەکە دەباتە سەرەوە، بە پێچەوانەوە بردنی ستوونەکە بۆ سەرەوە، پیاکێشانی فیشەکەکە دەبات بۆ سەرەوە، تووڵی کۆکردنەوە (دەسکی تووڵی گۆڕینی نیشانەی پێشەوە) بەکاردێت بۆ گۆڕینی نیشانەی پێشەوە بۆ خوارەوە یان سەرەوە، وێنەکەی خوارەوە ببینە:

<u>لوولەکی بەرهەڵستی هەوا:</u> لوولەکەکە بەروە چەپ بەریت، پیاکێشانی فیشەکەکە دەبات بۆ لای ڕاست، بە پێچەوانەوە، بەرەو ڕاست دەیبات بۆ لای چەپ، تووڵی گۆڕینی نیشانەی پێشەوە(تووڵی نیشانە گۆڕینی M249) بەکاردێت بۆ جوڵاندنی لوولەکی بەرهەڵستی هەوا، وێنەکەی خوارەوە ببینە:




**<u>نیشانەی پشتەوە:</u>** نیشانەی پێشەوە دەکەوێتە کۆتایی نیشانەی لیف(گەڵا)وە، گۆڕینی سلایدەکە بۆ پێشەوە و دواوە، مەوداکە بەپێی ژمارە نووسراوەکان دەگۆڕێت، بۆ مەودای کەمتر لە ١٠٠ مەتر، بیخە سەر (S)، بۆ ١٠٠ مەتر بیخە سەر (١)، بۆ ٢٠٠ مەتر بیخە سەر (٢) ...هتد، وێنەکەی خوارەوە ببینە:



# ئاڕ پی جی-٧







پێش بەکارهاتن

پێویستە پێش بەکارهێنان بەشی یەکەمی تۆپەکە (پێزدار) بەسترابێت بە بەشی دووەمەوە (سەری تۆپ و بزوێنەری بەردەوامی)

# ئاڕ پی جی-٧




| | |
|---|---|
| ڕێژەی تەقەکردن: | ٤.٦ فیشەک لە خولەکێکدا |
| مەودا: | |
| مەودای ئامادەکردنی ئاڕ پی جی: | ٥ مەتر |
| مەودای بینین(زۆرترین): | ٥٠٠ مەتر |
| زۆرترین مەودای تۆپ: | ٩٠٠ مەتر بۆ تەقینەوەی تۆپ |
| خێرایی: | |
| سەرەتا: | ١١٧ مەتر لە چرکەیەکدا |
| قۆناغی دووەم | ٢٩٤ مەتر لە چرکەیەکدا |
| بڕینی زرێ لە ٠ پلەدا: | ٣٣.٠٢ سانتیمەتر |
| جۆری تۆپ: | گەرمی |

# مۆلۆتۆڤ

**مۆلۆتۆڤ:** ئامێریکە بەرامبەر بە ئوتومبێل و زیلی سەربازی سوودی هەیە، لە جەنگی ناو شاردا کاریگەرە چونکە مەودای جەنگ کورتە.




*پەرەی ژمارە ٧٦-٧٧ ببینە بۆ چەند ڕێگەیەکی تر بۆ بەکارهێنانی مۆلۆتۆڤ*

# درۆن

بە پێی توانای جەنگی ئەلکترۆنیی دوژمن، ئەوە دەکرێت بتوانن درۆنی بازرگانی بەکاربێنن، ئەمانە کەرەستەی جەنگی بەهێزن.

درۆن دەکرێت وەک گەریدە بەکاربێن بۆ دەستنیشانکردنی پلانی هێرشی دوژمن و بۆ ڕێگە گرتن لە هێرشی لەناکاوی دوژمن.

درۆن بەکاردێن بۆ ئەوەی بزانیت لە کوێدا تەقە لە دوژمن بکەی.

درۆن هەروەها دەکرێت بەکاربێنرێن بۆ هەڵدانی شت بەسەر دوژمندا.

درۆن ترس دەخەنە دڵی دوژمنەوە، ئەگەر بەردەوام سەیری ئاسمان بکەن و نەزانن چی لە ئاسماندا هەیە، لە ترسا دەبن، نازانن ئایا ئەوە درۆنێکی بکوژە یان تەنها درۆنێکی گەریدەیە.



# هێرش و هێرش و هێرش!

گەرچی ئامانجی بەرگریکردن لە شار ئەوەنەبێت کە هەموو دوژمنەکان بکوژن، ئەوە هێرشی بەردەوام و تایبەت یارمەتی دەدەن لە خۆڕاگری بەرامبەریان، تۆ دەبێت ئامانجەکەت ئەوەبێت کە هەموو شەقام و کۆڵانێکی شارەکە بکەیتە ئامێرێکی گۆشت هاڕین کە بەردەوام دوژمنی تێدەکەوێت.

# هەڵبژێرە بەرگری لە چی تەلارێک دەکەیت

تەلار و خانووی چیمەنتۆی پتەو هەڵبژێرە بۆ ئەوەی بەرگری لێ بکەی، بە دوای ئەو تەلار و خانووانەدا بگەڕێ کە دیواری ئەستووریان هەیە و لە چیمەنتۆی پتەوکراو دوسکراون.

ئەو تەلارانە بەکارمەهێنە کە دار و شووشەیان زۆرە، چونکە دەبنە هۆی شکاندن و سووتان.

ئەو تەلارانە بەکاربێنە کە مەودای بینینیان زۆرە و دەتوانیت لە دوورەوە تەقە لە دوژمن بکەیت لێوەی.

بەردەوام پلانێکت با هەبێت بۆ دەربازبوون لە تەلارەکە، ئیتر ئەمە لە ڕێی ئەو کونانەوە بێت کە خۆت هەڵتکۆڵیوە یان لە تونێلی ژێرزەمینی تەلارەکە خۆیەوە.



# خاڵی بەهێز دروستبکە لە نێو شارەکەدا

خاڵی بەهێزی ناو شار تەلارێکی پتەوە کە توانای ئەوەی هەیە لێوەی بەرگری لە دەوروبەرەکەی بکەی، هێزی بەرگری پێویستە چەک و کاتی زۆر تەرخان بکات بۆ زیاتر بەهێزکردنی ئەم شوێنانە.

هێزی بەرگری شار بەربەستەکانی دروست دەکات بۆ ئەوەی دوژمنەکەی ناچار بکات هێرش بەرێتە سەر خاڵە بەهێزەکانی.

دوژمن چەند ڕۆژێکی دەوێت تا ئەم خاڵە بەهێزانە بگرێت.

بۆ نموونە، لە جەنگی جیهانی دووەمدا، لە جەنگی ستالینگراد، نزیکەی ٢٠ سەربازی سۆڤیەت توانییان تەلارێکی ٤ نهۆمی بکەنە خاڵێکی بەهێز، تەلارەکە مەودای بینینی زۆر بوو و دەیتوانی سێ لای خۆی لێوە ببینی و دەڕوانییە سەر حەوشەیەکی فراوان، ئەوان دەوری تەلارەکەیان تەلبەند کردبوو و مینی دژە پیادە و دژە تانکیان چاندبوو، لە دیوارەکاندا کونیان دروستکردبوو بۆ ئەوەی ڕێڕەوی بچوک دروستبکەن و دۆشکەیان لە سووچەکانی تەلارەکە دانابوو، لە کاتی تەقەی ناڕاستەوخۆی وەک هاوەندا، دەچوونە ژێرزەمینەکە و لە کاتی هاتنی تانکدا دەچوونە نهۆمەکانی سەرەوە و بە چەکی دژە تانک دەیانکردنە ئامانج و بە ئاسانی دەیانتەقاندنەوە چونکە لە زرێ لاوازەکەی سەر تانکەکەیاندەدا.

سەربازەکان توانییان بۆ ماوەی ٥٨ ڕۆژ تەلارەکە بگرن بەرامبەر بە هێرشی تانک و زیل و پیادە و توانییان ژمارەیەکی زۆر لە دوژمن بکوژن لەو ڕۆژانەدا، تەلارەکە دوایی بە (ماڵی پاڤلۆڤ) ناویان هێنا.

# ئەمە خانوویێکە کە کراوە بە خاڵێکی بەهێز



1. کونێکی بچوک لە دیوارەکەدا، ژێر بنمیچەکە
2. شەرکەرەکە لە نهۆمی سەرەوە
3. کونێک لە زەوییەکەدا
4. قەپاغ
5. تۆڕی تەل
6. پەردە
7. کۆڵەکە(ستوون)
8. پلاستەرەکی لابەرە یان سەرێکی پتەوی بۆ دابنێ
9. دوو چین توورەکەی لم لەسەر زەوییەکە
10. دەرگاکان
11. پارچەیەک بۆ خاوکردنەوەی دوژمنەکان
12. لم
13. داری ستوونی تەلبەندکراو
14. کارتۆنی پڕ لە بەرد
15. زەوییەک
16. لابردنی نەمامەکە
17. پارچەیە تەختەی پڕ بزمار(بەشێکی بچوک جێهێڵراوە بۆ هێزی بەرگریکەر)
18. ئاو
19. فیشەک
20. کارتۆنی پڕ لە بەرد
21. دەرگایەک بۆ دەربازبوون
22. تەلبەند کە لە سوچەکاندا چرکراون
23. بانیێوی پڕ لە ئاو
24. بۆری ئاوی باران لابراوە
25. کونێک بۆ پەیوەندی کردن

28

# ئامادەکردنی خانوویێک بۆ بەرگری



ئەو کارانەی پێویستن بۆ باشترکردنی بەرگرییەکانت کۆتاییان نییە، تەنیا کۆسپ لەبەردەمتدا ئەو کاتەیە کە لە بەردەستدایە، پاش ئەوەی  هێڵی تەقەکردنەکانت دیاریکرد و شتت دانا بۆ کەمکردنەوەی هێڵی تەقەکردنی دوژمن، پێویستە کاتەکەت بە باشی دابەش بکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت باشترین هەلت هەبێت بۆ بەرگریکردن لە شوێنەکە..

**کونی ڕومانە هەڵدان**

پێویستە کونی بچوک هەبێت لە زەوییەکانی هەریەکێ لە نهۆمەکان بۆ ئەوەی کاتێک دوژمن لە نهۆمەکانی خوارەوە بوون بتوانی ڕومانەیان بۆ هەڵبەیتە خوارەوە لە جێگای شەڕکردنەکەی خۆتەوە

دوکەڵکێشەکە لە بیر مەکە، بە تەلبەند پڕیکەرەوە

**هەموو پلاستەرەکان لێکەرەوە**

پلاستەری بنمیچەکان لێکەرەوە و بەکاریان بێنە بۆ پڕکردنی توورەکە لمەکانت، ئەگەر ئێستا پلاستەرەکان لێکەیتەوە، ئەوە دوایی ناکەوێت بەسەر سەرتدا لە کاتی شەڕکردندا.

ئاو!

**سەرنجدان**

کونێک لە دیواری بن بمیچەکە بکە بۆ بینین و ئاگاداری

**پەردە یان گوێنی بەکاربێنە**

بۆ داپۆشینی پەنجەرەکان، تەلی پێوە بکە بۆ ڕێگریکردن لە ڕومانە

**پێویستە تەختەی دارین لابریێت لە خواروو پەنجەرەی نهۆمی خوارەوە بۆ ئەوەی گەر دوژمن لا پەنجەرەکەوە بێتە ژوورەوە نەچنە سەر زەوی توند، بزمار و شووشەی شکاو بخە چوارچێوەی پەنجەرەکەوە**

**پاراستن بۆ پەنجەرەکان و (تابوت)ەکە،**
تەلبەندکردن ڕێگری لە ڕومانە دەکات بکەوێتە ئەمدیوەوە، بەڵام ئەگەر دەوروبەری شوێنی تەقەکردنت داپۆشی بە توورەکەی لم ئەوە ئەتپارێزێ لە تەقینەوەی ڕومانەکە و ڕوخاندنی بنمیچەکەت، پاشان ئەگەر دوژمنەکە هاتە ژوورەکەتەوە ئەتوانی ڕومانەیەک هەڵبەیت لە سەروو تابوتەکەتەوە بۆ ناو ژوورەکە

کاتێک هەموو ئامادەکارییەکانی تر تەواو بوون، پلیکانەکان لابەرە یان بە تەختەی پڕ لە بزمار دایانبپۆشە

**شەڕکردن لە تاریکیدا** ژوورەکان هەمووی لە تاریکی تەواو یان نیو تەواو دەبن، بۆیە دەتوانی تەلبەندی بەرز و پێچاوپێچی نزم بەکاربهێنیت لە ژوورەکاندا، ئەمە کارەکەی ئەوەیە هێرشکەر خاودەکاتەوە و کاتت دەداتێ بچیتە دەرەوە لە ژوورەکە گەر زانیت ژوورەکە دەگیرێت

**خزمەتگوزاری گشتی**

گاز مەترسییەکی ڕاستییە، بۆیە لە دەرەوی خانووەکە بیکوژێنەوە، هەمان شت بۆ کارەباش گەر دوژمن توانی بێتە ماڵەکەوە، شەڕکردن لە تاریکیدا دەبێتە خاڵی بەهێزی تۆ بەسەر دوژمنەوە چونکە تۆ کون و کەلەبەری ماڵەکە شارەزایت و بەڵام ئەو نایزانێت.

بەرگریکردن لە نزیکەوە بەکارهێنانی دوو ڕۆڵی تەلبەند کە مینی لەگەڵدا دانراوە، ڕێگری لە دوژمن دەکات کە تەقەمەنی (ماوسهۆڵینگ) بەکاربێنن

# دیواری قوڵ(ماوسهۆڵ) دروستبکه

دیواری قوڵ و تونێل دروستبکه، دیواری قوڵ مەبەست ئەو کونانەیە کە لە ناوەوە و دەرەوەی دیواری خانووەکە دەکرێت بۆ ئەوەی چەکدار بتوانن بە ئاسانی بە نێو دیوارەکانی دەرەوە و بەشەکانی ناوەوەی خانووەکە بڕۆن، تەکتیکی بەکارهێنانی دیواری قوڵ یەکێکە لە سەرەکیترین و باشترین تەکتیکەکانی بەرگری، ئەم تەکتیکە ڕێگەت پێ دەدات کە بە شاراوەیی و پارێزراوی بجوڵێیتو تەقە بکەی لە بینا و خانووی چیمەنتۆدا، تونێلەکان ڕێگەت پێدەدەن لە بۆمبارانکردن دەربازبیت.



# تونێل بەکاربێنە و دروستکە

باشترین تەلار و خانوەکان ئەوانەن کە تونێل لە ژێریاندا هەیە.

ئەمە ڕێگە بە هێزی بەرگری دەدات لە نێوان تەلار و خانووەکاندا بگەڕێن بێ ئەوەی ببینرێن، ئەمە ڕێگە بە هێزی بەرگریکەر دەدات کە خۆیان لە بۆمب بپارێزن.

ئەگەر هیچ تونێلێک نەبێت، هەوڵ بدە دروستی بکەیت.



# له ناوەوە و دەرەوەی بیناکان سەنگەر و مەتەرێز لێبدە

گەر کاتت هەبێت، سەنگەری دەستیی دروستبکە، بۆ نموونە سەنگەری داپۆشراو، پێویستە لە سەرەوە داپۆشرابن (سەرەوەیان چیمەنتۆ بێت) و لە سەرەوە دیارنەبن.



# چەکی قورس لە ناو بیناکان دابنێ

دەتوانی کە چەکی قورس لە ناو بیناکاندا دابنێی، چەکی قورس دەتوانن هەڵبوەشێنرێن و پێکەوەبنرێنەوە لەسەر نهۆمە بەرزەکانی بینایەک بۆ ئەوەی مەودای زیاتر و گۆشەی تەقەکردنی زیاترت باتێ، ئەمەش دەبێتە بەرگرییەکی باش بۆ ئەو چەکە قورسەی کە زۆرترین زیانی دەبێت بۆ دوژمن.



# کەرەستە و پێداویستییەکان لە هەموو جییێەک دابنێ

لە هەرجێییەک بڕیاربوو شەڕبکەی، ئیتر جێێ سەرەکی بێت یان لاوەکی، ئەوە بزانە کە ناوشار زۆر باشە بۆ شاردنەوە و پاراستنی پێداویستییەکان، کە دەتوانی بەکاری بێنی.

کاتێک لە شاردا دەجەنگی دەکرێ بەهۆی جەنجاڵییەوە سەرت لێ بشێوێت، نیشانەیەکی تایبەت دابنێ لە دەرەوەی تەلار و خانووەکان کە تەنها تۆ و تیمەکەت دەتوانن بیناسنەوە، ئەمانە بکە بە کۆگای چەک و کەرەستەی جەنگی.



# له بیناکانەوە تەقە بکە (دوورکەوە لە شەقامەکانەوە)

شەقامەکانی نزیک بیناکە بەکاربێنە بۆ هێرشکردن، نهۆمە بەرزەکان باشتریشن لەوە، چونکە تانک و هەنێک چەکی قورسی تر ناتوانن لوولەکەیان ئەوەندە بەرزبکەنەوە کە بتوانن بتکەن بە ئامانج، هەروەها ئەستەمیشە بۆ هێرشکەر کە تەقە لە شوێنێکی بەرزبکات، هێزی بەرگری پێویستە بەردەوام بە شاراوەیی لە ناو خانوو و بیناکان بمێننەوە تا ئەو ساتەی بڕیاردەدەن هێڕشبکەن و شوێن بگۆڕن.



# لە ناو بیناکانەوە تەقە بکە

هیچ هۆیەکی باش نییە بۆ ئەوەی هێزی بەرگری ناو شار لە ئاسمانەوە دیاربێت لە لایەن هێرشکەرەوە، لوولەی چەکەکەت لە پەنجەرەکانەوە مەکە دەرەوە، لە جێی خۆت بمێنەرەوە و لە ناو ژوورەکانەوە تەقە بکە بۆ ئەوەی دوژمن نەوبینێ.

لەشکر زۆر لە نیشانەشکێن (قەناس) دەترسن، ئەگەر توانیت ئەوە هەموو پەنجەرەیە بکە بە جێی نیشانەشکێن، بە نێو ژوورەکان و بیناکان تەقە بکە بۆ دەرەوە.



# باش بیر بکەرەوە پێش تەقەکردن

دووبارە، مانەوەت بۆ شەڕکردن گرنگە، بۆیە بە باشی بیری لێبکەرەوە تەقە لە کوێ دەکەیت، جێگای بەرز هەڵبژێرە تەقەی لێوە بکەی، تەقە بکە و بجووڵێ، داودانێ بۆ دوژمن، نیشانە بگرەوە لە پەنجەرە و دەرگاکانی ئوتومبێلەکانی زرێپۆش نین، نیشانە بگرەوە لە سەربازی پیادە کە لە شوێنی کراوەیان، ئەوە بزانە یەکێک لە گەورەترین ترسەکانی هەر سەربازێک نیشانەشکێنە.



# جێی شەڕکردن دروستبکە (زۆنی کوشتن)

یەکێک لە بەهێزترین تەکتیکەکانی بەرگری دروستکردنی شوێنی شەڕکردنە (زۆنی کوشت، واتە شوێن کە تیایدا دوژمن دەکووژرێت).

٧ هەنگاوی ئاسان بۆ دروستکردنی زۆنی کوشتن (بە شێوەیەکی سادە

- هەموو ئەگەرەکانی شێوازی هاتنی دوژمن دیاریبکە.
- دەستنیشانی بکە دوژمن ئەگەر بێت چی دەکات یان هەوڵدەدات چی بکات.
- دەستنیشانی بکە لە کوێدا دەتەوێ لە دوژمن بدەیت.
- بەربەست دابنێ، بۆ خاوکردنەوە یان وەستانی دوژمن.
- بڕیاربدە لە کوێ خۆت بشاریتەوە یان تەقە بکەی.
- پلان داڕێژە بۆ تەقەی ناڕاستەوخۆ (وەک مۆلۆتۆف).
- چەندین جار ڕاهێنان بکە بۆ پلانەکە بۆ ئەوەی ڕابێیت.



# هێرشی لێدان و هەڵاتن بکە (شێوازی گەریلا)

تەکتیکی لێدان و هەڵاتن بەکاربێنە، داوی دژە زرێ دابنێ. لە یەکەمین جەنگی گرۆزنی، تیمی بچوکی تەنها ٣-٥ کەسی بە کلاشینکۆڤ و ڕومانە و ئارپیجی (RPG-7 RPG-18)ەوە جەنگان لەگەڵ زیل و ئوتومبێلە زرێپۆشەکان لە ژێرزەمین و نهۆمی سەرەوەی تەلارەکانەوە، واتە ئەو جێگایانەی کە تانک و چەکی قورس ناتوانن تەقەی لێ بکەن، ئەم داوە بەم شێوەیە دەبێ: لە یەکەم ئوتومبێل و کۆتا دانە دەدەن، ئیتر بەو شێوەیە ئەوانەی ناوەڕاست دەچەقن، لێیان دەدەیت و هەڵدێیت.




39

# تانک

هێزی هێرشکەر لە جەنگێکی توندی ناوشاردا، پێویستی بە تانکە بۆ ئەوەی بچنە شارەکەوە، پێویستیان بە تانک و سەربازی پیادە و تۆپ و شتی ترە، بەڵام لە هەمووی گرنگتر پێویستیان بە تانکە، بۆیە هێزی بەرگری دەبێت شکاندنی تانکەکان بکات بە ئامانجی سەرەکی.

تانک ناتوانن لوولەکەیان نیشانەی نهۆمی بەرز و ژێرزەمین بکەنەوە، کاتێک دەتەوێ لە تانکێک بدەیت، لە جێگایەکەوە لێیبدە کە نەتوانێ ئەو تەقەت لێبکاتەوە.






# بەشی سەرەوەی تانکەکە خاڵی بێهێزییەتی

خاڵی لاوازی هەموو تانکێک لوتکەکەیەتی (بەرزترین خاڵی تانکەکە)، لەوێدا ماددەکە تەنکە، بۆیە دوژمن لە چەکی javelin دەترسن لەگەڵ چەکی دژە تانکی تر کە بە چەکی (هێرشی سەرەوەی تانک) ناسراون، واتە دەچنە ئاسمان و دێنەوە خوارەوە بۆ سەر لوتکەی تانکەکە، ئەگەر هێزی بەرگریکەر ئاڕپیجی پێبوو کە ناتوانێ بە زرێ ئەستوورەکەی تانکەکەدا بڕوات یان ڕوومانی دەستیی دژەتانک، باشترین شت ئەوەیە لە نهۆمەکانی سەرەوە هەڵیبدات سەر تانکەکان.



# تانکی داخراو پشت دەبەستێ بە ئامێرێک بۆ بینین کە کوێر دەکرێت

هێزی بەرگریکەر دەکرێ نەتوانن تانکێک بشکێنن، بەڵام دەتوانن لە کاری بخەن، یەکێک لە ڕێگاکان بۆ ئەمە، کوێرکردنی تانکەکە، کە وای لێدەکات دەستەی ناو تانکەکە نەتوانن بە باشی ببینن، ئەگەر تەقە لە شوێنی بینینەکانیان بکەیت (کە لە خوارەوە بە سوور نیشانەکراون)، بەتایبەتی گەر بە چەکی قورس تەقەیان لێبکەیت وەک ئارپیجی.

بەشی سەرەوە چەپی تانکەکە لە وێنەکەدا، جێی بینینی فەرماندەی تانکەکەیە، لای سەرەوە ڕاست زۆربەی کات شوێنی کەسێکی سەربەخۆیە لێوەی دەڕوانێت(بە پێی جۆری تانکەکە ئەمە دەگۆڕێت)، جێگەی بەردەم تانکەکە، لە خوارەوەی لوولەکەی جێی بینینی سەرەکی لێخووڕەکەیە، تەقە لەم جێیانە بکە یان شتیان تێبگرە بۆ ئەوەی ئەم جێێ بینینانە بگریت.



# بەکارهێنانی مۆلۆتۆڤ

مۆلۆتۆڤ چەکێکی کاریگەرە ئەگەر بە ڕێکوپێکی بەکاربهێنرێت، لە جێگای پارێزراوەوە هەڵیبە، نیشانەی گونجاو و شوێنی تایبەتی ئۆتومبێل و تانکەکان بکە بە ئامانج.
بە باشی بیر لەوە بکەرەوە لە کوێوە مۆلۆتۆڤەکە هەڵبدەیت و یەکسەر ڕابکەیت، باشترین جێگا پەنجەرەی سەروو تانک و ئۆتومبێلەکانە، ئەو ئامڕازی گواستنەوانەی کە چەک بەسەریانەوە نییە لە هەمووی لاوازترن بەرامبەر بە مۆلۆتۆڤ، بەڵام ئەگەر زرێ(درع)ی پێوە بوو، ئەوە بە باشی هەڵیبژێرە دەینێیت بە کوێوە.

**جێگا لاوازەکانی کەلووپەلی دوژمن:**





# مۆلۆتۆڤ و هێرشی نزیک تانکی تر

مۆلۆتۆڤ هیچ کاریگەرییەکی وای نابێت لەسەر تانکێکی داخراو، بەڵام ئەگەر دەرگاکانی کرابێتنەوە، ئەوکاتە مۆلۆتۆڤ دەکرێت کاریگەر بێت، دەکرێت وا لە تانکێک بکات ڕاوەستێ یان خاوبێتەوە، ئەوەش دەیکات بە ئامانجێکی ئاسانتر بەرامبەر چەکی دژە تانک یان کەرەستەی باشتر.

دوو مۆلۆتۆڤ باشترە لە یەک دانە، وەک بۆردومانێکی مۆلۆتۆڤ لە هەر لایەکی شەقامەکەوە لە نهۆمەکانی سەرەوەی بیناکان.



# درۆن و فڕۆکەی هێرش

چەکی سووک دەکرێ بەکاربێنرێن بۆ خاوکردنەوەی فڕۆکە و هەلیکۆپتەر(پەروانەدار) و درۆنەکان، ئەمەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی (تەقەی قەبارەیی) و هەروەها خاڵی نیشانەگرتنەوەی ڕێکوپێک بە پێی نیشانەکە.

ئەگەر هێزی بەرگری ڕاهێنرابێتن بۆ ئەوەی بزانن چۆن بە شێوەیەکی باش هەڵسوکەوت لەگەڵ فڕۆکە و درۆندا بکەن ئەوە کاردانەوەیان بۆ ئەو دوو جۆرە هێرشە یەکسەری دەبێت، بۆیە پێویستە ڕاهێنان ببینن، ئەوەش بە پێی پەیڕەوکردنی چەن یاسایەکە لەسەر هەڵبژاردنی خاڵی نیشانەگرتنەوە.

بەم شێوازە، هێزی بەگری دەتوانێت بەرگرییەکی باش بات بەرامبەر درۆن و فڕۆکە تەنها بە بەکارهێنانی چەکی سووک.

# تەقەی قەبارەیی

بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کاریگەر ڕووبەڕووی فڕۆکە و درۆن ببیتەوە، پێویستە پەیڕەوی ئەم بنەما سادانە بکەی:

یەکەم بنەما ئەو تەکنیکەیە کە بە (تەقەی قەبارەیی) ناسراوە، کلیلی سەرکەوتنی بەرەنگاربوونەوەی فڕۆکەی دوژمن ئەوەیە قەبارەیەکی زۆر لە تەقە بکەیت، تا فیشەکی زیاتر هەڵبەیتە ئاسمانەوە، هەلی زیاتر هەیە کە یەکێک لە فڕۆکەکان بەریکەوێ.

یەکێک لە گرنگترین خاڵەکان دەربارەی ئەم بنەمایە ئەوەیە ئەو کاتەی کە دوورییەکەت هەڵسەنگاند هەمووی تەقە لەو خاڵە بکەن تاوەکوو فڕۆکە یان درۆنەکە بەو خاڵەدا دەفڕێت، وەک وێنەکەی خوارەوە، کە دەستت کرد بە تەقەکردن هەر لەو خاڵەی بکەن، نیشانە مەگۆڕن.



# تەکنیکی یاریگای تۆپی پێ

تەکنیکی یاریگای تۆپی پێ شێوازێکی سادەیە بۆ هەڵسەنگاندنی دووری دەمی تفەنگەکان بۆ ناوەڕاستی نیشانەکە، زۆربەی کەس تۆپی پێیان بینیوە و بیرکردنەوەیەکی گشتییان هەیە دەربارەی درێژی یاریگای تۆپی پێ، کاتێک دەووترێ تەقە بکرێ بە دووری یەک یاریگای تۆپی پێ، ئەوە تەنانەت گەر یەکێک لە بەرگریکەرەکان هەڵە بکات لە هەڵسەنگاندنی درێژی یاریگاکە، تەقەی بەرگریکەرێکی تر دەتوانێ بۆی ڕاست بکاتەوە، ئەم جیاوازییە لە خاڵی نیشانەدا دڵنیایی ئەوە دەدات کە تەقەکردنەکە بتوانن مەودایەکی زۆر بگرنەوە وەک لە یەک خاڵ، هەورەها ئەم جیاوازی هەڵسەنگاندنی درێژ یاریگایە لە نێوان تەقەکەرەکان وای لێ دەکات کە تەقەکان مەودایەکی زۆر بگرنەوە، وێنەکەی خوارەوە ببینە.



# ڕەوشی تەقەکردن بۆ بەرگری ئاسمانی

هێزی بەرگری دەتوانن هەموو ڕەوشەکان بەکاربێنن بۆ بەرگری ئاسمانی جگە لە ڕەوشی چوونە سەر سک، بە پێچەوانەوە، لەسەر پشتت(بڕبڕەی پشتت) پاڵکەوە و نیشانە لە سەرەوە بگرەوە، وێنەکەی خوارەوە ببینە.

بەردەوام لە پشت پارێزگارییەوە بە ئەگەر توانیت.



# بۆسە

هێزی بەرگری دەتوانن سوود لە بۆسەدانانەوە وەربگرن وەک بەشێک لە هەوڵی بەرگرییان، لێرەدا بەتایبەتی پێویستە سوود لە ژینگەی ناوشارەکە وەرگرن، بەڵام بێجگە لەوە دەتوانن لە ڕێگای نێوان شارەکانیش ئەم تەڵانە دابنرێن، ئەو ڕێگایانەی کە خاڵی لاوازیان زۆرە.

بۆسەدانانەوە ئەوپەڕی هێرشی کتووپڕیی سەربازییە، تەکتیکێکی سەربازییە کە پێویستە زۆر باش ڕاهێنان و پلانی بۆ کرابێت، پێویستە بە هۆشیارییەکی زۆرەوە ئەنجامبدرێت.

بۆسەدانانەوە، هێرشێکی کتوپڕە لە جێگایەکی شاراوەوە بۆ سەر ئامانجێکی جووڵاو یان ئامانجێک کە بۆ ماوەیەکی کاتیی وەستاوە.




دوو جۆری بۆسەدانانەوە هەن: **پەلەپەل** و **بەمەبەست**.

سێ جۆر بۆسەدانانەوە هەن:

**خاڵ:** لەم شێوەیەدا، هێزی بەرگری لە یەک زۆنی کوشتندا هێرش دەکەنە سەر دوژمن.

**جێگا:** لە جێگایەکدا، هێزی بەرگری لە دوو خاڵ یان زیاتردا دادەمەزرێن.

**دژە تانک:** بۆسەی دژە تانک سەرنج دەخاتە سەر بە ئامانجکردنی تانک و زیلی سەربازی کە لە جووڵەدان یان بۆ ماوەیەکی کاتی وەستاون.

دوو جۆر پێکهاتەی سەربازی هەن: پێکهاتەی **هێڵ**، پێکهاتەی شێوازی **گۆشە وەستاو**.

# بنەماکانی بۆسەدانانەوە

**پارێزراوی** – هێزی بەرگری ناو شار پێویستە بەردەوام خۆیان بپارێزن، لە کاتی بۆسەدانانەوەدا، پاراستنی شەرِکەرەکان زۆر گرنگە، پلان دابنێ بۆ ئەوەی هێزی بۆسەگر لە کاتی چوونیان بۆ جێگای مەبەست پارێزراوبن، هەروەها لە کاتی چالاکییەکە و لە کاتی دەربازبوونیشدا پارێزراوبن، هێزێکی پاراستن هەمیشە یەکەم هێزن کە پێویستە لە جێگای بۆسەکە دابنرێن.

**بنمای کتوپڕیی (سوپرایز)** – بۆسەکە دەبێت شتێکی کتووپڕ بێت بۆ دوژمن، دەبێت لە شوێن و کاتێکدا بێت کە دوژمن پێشبینی نەکات، بۆیە پێویستی بە پلاندارِشتن و شاراوەیی و خۆڕاگری (دیسیپلین)ێکی زۆرە بۆ بۆسەدانانەوە، ئەگەر بنەمای سوپرایز لەدەستبدەیت ئەوە هەموو شتێک لەدەست دەدەین.

**توندوتیژی لە جوڵەدا** – بۆسەدانانەوە پێویستی بە تەقەکردنێکی زۆر و جوڵەی خێرا و بەهەڵمەتە، پێویستە هەردوو لەم بنەمایانە بە درێژایی کاتی بۆسەکە بمێننەوە.

**تەقەکردنی هاوتا** – بۆسەکە پێویستە کار لەسەر ئەوە بکات کە زۆنی کوشتنەکە جیابکاتەوە لە بەشەکانی تری لەشکری دوژمن بۆ ئەوەی نەهێڵێت دوژمن سەربازی تر بێنن یان ئەوانەی لە ناو زۆنەکەدان دەربازبن، پێوویستە هەموو چەکێک و هەروەها مینیش بەکاربهێنرێت، سەرکردەی بۆسەکە پێویستە دڵنیابێت کە هەموو چەکەکان لە یەک کاتدا بەکاردێن، ئەمەش بۆ ئەوەی زۆرترین زیان بگەیەنن بە دوژمن لە چرکەکانی سەرەتادا.

**کۆنترۆڵکردن** – سەرکردەکە پێویستە کۆنترۆڵی کردەوەکانی هەر یەک لە گروپەکان بکات لە بۆسەکەدا، پێویستە جوڵەکردن و چاوەڕێکردن و دەربازبوون لەخۆبگرێ، ئەم کۆنترۆڵکردنی گروپە زۆر گرنگە کاتێک دوژمن نزیک دەبنەوە.

# ڕێکخستنی بۆسە

- **سەرکردەکان** – پێویستە چالاکی بۆسادانانەوەکە یەک سەرکردەی هەبێت و هەر یەک لە تیپەکان سەرکردەیەکی خۆیان هەبێت.
- **تیپی هێرشکردن (Assault)** – تیپی هێرشکردن لە کاتی بۆسەکەدا تەقەدەکەن، دەست دەگرن بەسەر ناوچەی بۆسەکەدا، بەرگریکەرەکان دەپارێزن کە دەچنە زۆنی کوشتنەوە بۆ کاری تایبەت وەک هەڵگرتنەوەی چەکی دوژمن.
- **تیپی پشتگیری (Support)** – ئەو شەڕکەرانەی کە پشتگیری ڕاستەوخۆی تیپەکانی تر دەکەن.
- **تیپی پاراستن (Security)** – ئەو شەڕکەرانەی کە پێشوەخت دادەنرێن پێش هەموو ئەوانەی تر، کاری پاراستنی ئاسایش بۆ تیپەکان دەکەن و ئاگاداری زوو دەدەن و ئامانجەکە جیادەکەنەوە و لە کاتی دەربازبووندا لە ناوچەکە کاری پشتگیری دەکەن.

# بیرکردنەوە پێش بۆسەکە

پاش ڕێکخستن بۆ بۆسەدانانەوە، هێزی بەرگری ناو شار پێویستە باش بیری لێبکاتەوە و پلانی بۆ داڕێژێت، کەرەستەیەکی هاوبەش بۆ تیپە سەربازییەکان بۆ پلاندانان و بیرکردنەوە لە بۆسەدانانەوە ئەمانەن: ئەرکی سەرەکی، دوژمن، کات، ژینگەکە، هەروەها ئەو شەڕکەرانەی کە ئامادەن.

**ئەرکی سەرەکی** – هەموو ئەندامەکانی گروپی بۆسەدانانەوەکە پێویستە بزانن چی دەکەن و ئەرک و کارەکەیان چییە بە وردی و هەروەها بۆچی ئەم کارە دەکەن، هەموو ئەندامێکی هێزی بەرگری پێویستە بزانن.

**دوژمن** – تیپی بۆسەگرەکان پێویستە بیر لە دوژمن بکەنەوە، هەرگیز هێرش مەبەنە سەر هێزێکی دوژمن کە نەتوانن بە چەکەکانتان سەرکەون بەسەریاندا، بیر لە قەبارەی ئەو دوژمنە بکەرەوە کە هێرشی بۆ دەبەیت یان نابەیت، بیر لەوە بکەرەوە کە ئەگەری زۆرە دوژمنەکە لە کاتی بۆسەکەدا چی بکات، ئایا پشتگیرییان بۆ دێت؟ ئایا دەتوانن زەنگ لێبدەن بۆ یارمەتی؟ ئایا چی چەک و کەرەستەیەکیان لەبەردەستدایە؟

**کات** – پێویستە هێزی بۆسەگر بیر لەوە بکەنەوە کە چەندێکیان پێ دەچێت بۆ ئەوەی بگەنە جێگای بۆسەکە، چەندێک کاتیان دەوێت بۆ ئامادەکردنی بۆسەکە و کاتێک کە ئامادە بوون چەندێک پێویستە لە چاوەڕوانیدا بن و هەروەها ئایا لە شەودا دەبێ یان ڕۆژ؟

**ژینگەکە** – هێزی بۆسەگر بیرلەوە دەکەنەوە باشترین جێگا کوێیە بۆ بۆسەکە و چۆن بگەن بە جێگاکە و چۆن سوود لە ڕێگا و ژینگەی ناو شار و بەربەستەکان ببینن بۆ ئەوەی توخمی کتوپڕیی بۆسەکە بهێڵنەوە و بتوانن بە ڕێکوپێکی ئەنجامی بدەن.

**شەڕکەری ئامادە** – واتە چەند کەس هەن ئامادەبن بچنە هێزی بۆسەگرەکەوە و هەروەها چەند کەس پێویستە لە هەر تیپێکی هێزی بۆسەگرەکەدا؟

# بۆسەدانانەوەی شێوەی خاڵی بە مەبەست

شێوە بۆسەیەکی بەهێز بۆسەیەکی خاڵی بەمەبستە، کە پێشوەخت بە وردی پلانی بۆ دارێژراوە و بەرامبەر بە نیشانەیەکی تایبەت دەکرێت لە جێگایەکدا کە پێشوەخت هەڵبژێردرابێ.

لە بۆسەی خاڵدا، هێزی بەرگری دادەمەزرێن بە مەبەستی هێرشکردنە سەر نیشانەیەکی تایبەت لە بۆسەیەکی تاکدا لە یەک زۆنی کوشتندا.

سەرکردەی تیپی بۆسەگر پێویستی بە زانیاری وردە لە پلاندانان بۆ بۆسەیەکی بەمەبەست، لەوانە زانیاری لەسەر:

قەبارە و پێکهاتەی دوژمنەکە

ئەو چەک و کەرەستانەی بۆ دوژمن هەن

ڕێگا و ئاڕاستەی دوژمن

شوێن و کاتی بۆسەکە




Figure 7-4. Deliberate ambush

LEGEND
LOA – limit of advance; OBJ – objective; ORP – objective rally point; PL – platoon leader; RECON - reconnoiter



Image and con

# هەڵبژاردنی شوێن و پێکهاتە (١)

هێزی بەرگری باشترین جێگا هەڵدەبژێرێت بۆ بۆسەکە بۆ ئەوەی زۆرترین سوود لە بنەمای هێرشی کتوپڕ وەرگرن و سەرکەون.

**هێڵ** – لە بۆسەیەکدا کە پێکهاتەی هێڵ بەکاردەهێنێت، تیپی هێرشکردن و پشتگیریکردنەکان بە هاوتەریبی ڕێی دوژمن خۆیان دادەمەزرێنن، ئەمە هەردوو توخمەکە بە درێژایی هێڵی زۆنی کوشتنەکە دادەنێت، بەو شێوەیە دەتوانن لە هەر دوو لاوە تەقە لە دوژمن بکەن، ئەم پێکهاتەیە دەکرێ بەکاربێت لە ژینگەیەکی داخراودا کە ڕێگری لە دوژمن دەکات بەرپەرچی تیپی بۆسەگر بەنەوە، یان لە ژینگەیەکی کراوەدا، بار دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی دوژمن لە زۆنی کوشتنەکەدا بمێننەوە.




**گۆشەوەستاو** – لە بۆسەدانانەوەیەکی گۆشەوەستاودا، تیپی هێرشکردن بەشە درێژەکەی گۆشەوەستاوەکە دەبن و بە درێژایی و هاوتەریبی لەگەڵ ئاڕاستەی دوژمن بۆ ناو زۆنی کوشتنەکە دادەمەزرێن، تیپی پشتگیریکردن دەبنە بەشە کورتەکەی گۆشەکە و بە هێڵی ستوونیی تیپی هێرشکردنەکە دادەمەزرێن، بەم شێوەیە هەم تەقە لە پێشەوە(لە لایەن تیپی هێرشکردن) و هەم تەقە لە لاوە دەکرێت(لە لایەن تیپی پشتگیریکردن)ەوە، بۆسەی گۆشەوەستاو دەکرێت لە سووچێکی تیژدا بکرێ، ئیتر ئەم سووچە لەسەر ڕێگا بێت یان جۆگە، بەڵام نابێت لە جێگایەکدا بێت کە تیایدا بەشە کورتەکە(تیپی پشتگیریکردن) ناچاربکرێن کە لە ڕێگایەک بپەڕنەوە.






Image and content (edited) credit: US Army Training Circular 3-21.76 Ranger Handbook

# هەڵبژاردنی شوێن و پێکهاتەی بۆسەکە (٢)



Figure 7-2. Ambush formations



Image and content (edited) credit: US Army Training Circular 3-21.76 Ranger Handbook

# چەند ڕونکردنەوەیەک لەسەر بۆسەداناناوە (١)

بۆسەدانانەوە ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی زۆر مەترسیدارە و پێویستە لە لایەن کەسانی ڕاهێنراوەوە ئەنجامدرێن و پێویستیان بە پلاندارشتن و ئاگاییەکی زۆرە.

بۆسەدانانەوە پێویستە وەک سوپرایز وابێت بۆ دوژمن، ئەگەر ئەو کتوپڕییەی لەدەست بدات و دوژمن زوو پێی بزانن ئەوە هێزی بەرگری پێویستە ڕابکەن لە جێگاکە.

سەرکردەکان پێویستە دڵنیابنەوە لەگەڵ هەریەک لە شەڕکەرەکانی هێزی بۆسەگرەکە بۆ ئەوەی بزانێ پلانی دانان و کردنی بۆسەکە دەزانن.

لە هەردوو لای بۆسەکەوە، تیپی پاراستن یەکەم کەس دادەمەزرێن، ئەوان کاریان ئەوەیە ئەوانەی تر بپارێزن، سەرکردەکانیان ئاگادار دەکەنەوە کاتێ دوژمن بەڕێوەیە و بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە کە ئەوە ئەو دوژمنەیە کە پلانیان بۆ دانابوو و پاشان بۆ داخستنی بۆسەک بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانن دەربازبن.

سەرکردەکان سەیری شوێنی بۆسەکە دەکەن بۆ ئەوەی دڵنیا بنەوە کە بەو شێوەیەیە کە پلانیان بۆ دانابوو، ئەم کارە هەروەها بە درۆنیش دەکرێت، بۆ ئەوەی هێزی بۆسەگر بە شاراوەیی بمێننەوە، بە پێ مەڕۆ بۆ شوێنی بۆسەکە.



# چەند ڕونکردنەوەیەک لەسەر بۆسەداناناوە (٢)

هێزی بۆسەگر دەبێت بەربەست دابنێ، تەنانەت مینیش دابنێ ئەگەر هەیانبێ بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە کە دوژمن نەتوانن بەرەو ڕوویان بنەوە کاتێ چالاکی بۆسەکە بەڕێ دەکەوێت.

سەرکردەکە پێویستە کۆنترۆڵی کاتی دەستپێکردنی بۆسەکە بکات.

بەردەوام بە گەورەترین مین یا چەک دەست پێ بکە کە هێزی بۆسەگر هەیەتی، کاتێک یەک شەڕکەر تەقە دەکات، پێویستە هەمووی دەست پێ بکەن بە تەقە.

سەرکردەی هێزی بۆسەگر دەتوانێ چەند کەسێ دیاریبکات بۆ ئەوەی بچنە ناو زۆنی کوشتنەکەوە بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە کە دوژمن مردوون و هەروەها چەک و کەرەستەکانیان بەرن.

هێزی بۆسەگر پێویستە پلانداڕێژێ بۆ ئەوەی زۆر خێرا دووركەوێتەوە پاش بۆسەکە چونکە دەکرێت دوژمنی زیاتر بەڕێوە بن، بۆ ئەمە کاتژمێر بەکاربێنە بۆ ئەوەی کاتی بۆ دابنرێ چەندێک بخایەنێ، پێویستە لە چەند خولەکێک زیاتر نەخایەنێت.

لە کاتی ڕۆشتندا، تیپێکی پاراستن جێبهێڵە لە شوێنەکە، ئەوان دەبێت کۆتا کەس بن کە جێگاکە بەجێبێڵن، بۆ پاراستنی هێزەکە.



# پاراستنی شەڕڤان

جەنگکردن لە ژینگەی ناو شاردا دەبێتە هۆی زیانێکی جەستەیی گەورەتر وەک لە جەنگی ژینگەی تر، هەم بۆ لایەنی هێرشبەر و لایەنی بەرگریکەر، بەرگریکەر پێویستە ئامادەبێت بۆ پاراستنی خۆی و بریندارەکان.

# کەرەستەی پزیشکی بۆ جەنگ و مانەوە

هێزی بەرگری شار ئەو کەرەستانە بەکار دەهێنن کە لەبەردەستیانە، ڕێبازی مانەوەی لەشکری ئەمریکی ئەم کەرەستانە بە پێویست دەبینێت وەک خاڵێکی سەرەتا بۆ کاری پزیشکیی جەنگ، زۆربەی دەکرێ لەبەردەستدا نەبن، بەڵام دەکرێ هەندێکی هەبێ.

- چەقۆ و مقەست
- دەرمانی پاککردنەوەی ئاو(وەک یۆد)
- بوتڵێکی بچوکی کوهول کە ٢٪ یۆدی تێدابێ
- لوولەیەکی بچوک لە چەسپی خێرا
- شووشەیەکی بچوک لە بێتادین
- پێچەفی فریاگوزاری تایبەت
- دەزووی پاککردنەوەی ددان
- تۆپێک تیپ
- کەرەستەی جۆراوجۆر بۆ تیمارکردن
- پلاستەر
- پێچەف و پەڕۆی پاک
- لەفافی جەنگ
- پەستێنکەر(تۆڕنیکە)، (SOFT-T) یان (CAT)، پلاستەری ئیسرائیلی یان تۆرنیکەی دەسکرد.
- دەستەیەکی کەم لە دەرمان
- کەرەستەی فرە مەبەست کە بۆ چەندین کار بەکاردێن:
  - ▶سەربەست (سرکەیی) تا گەورەتر بن باشترن (بەکاردێن بۆ گوشین و هەڵواسینی پەلی شکاو و تیمارکردن و هەروەها پینەی چاو)
  - ▶کەرەستەی پتەو (تەختەی ڕێک و دار و ستوون) هەریەکە لە درێژی جیاواز.

# فریاگوزاری سەرەتایی و پاراستنی ژیان

ئەم ٥ چەمکە بەکاردێن بۆ دیاریکردن و تیمارکردنی برین لە کاتی جەنگدا، لە باشترین ڕیزبەندیدان بۆ ئەوەی بتوانن ژیانی بریندارەکە درێژبکەنەوە تاوەکوو چارەسەری بۆ دەکرێ:

- خوێن بەربوونێکی زۆر
- بۆری هەوا
- هەناسەدان
- سوڕانی خوێن
- سەرمایی (هیپۆتێرمیا)

# خوێنبەربوونی زۆر بووەستێنە (١)






Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848









Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848

# خوێن بەربوونی زۆر بووەستێنە (٢)

پەستانی ڕاستەوخۆ بخە سەر برینەکە

برینەکە بە گۆز بپێچەرەوە




پەستانی توند و ڕاستەوخۆ بکە لەسەر جێگاکە بەلایەنی کەمەوە بۆ ٣ خولەک یان تاوەکو ئەو کاتەی کە خوێن بەربوونەکە دەوەستێت




بە توندی برینەکە پڕبکەرەوە بە ئیمارێکی خوێنڕاگر (هیمۆستاستک) کە پێکهاتەیەکی تایبەتی تێدایە یارمەتی دروستکردنی گرێی خوێن دەدات، ئەگەر ئەوە نەبوو ئەوە قوماشێکی پاک بەکاربهێنە

لەفاف ببەستە بە توندی لە دەوری پەلە بریندارەکە





بە ڕاکێشانی کورت بە دەوری پەلەکەدا بیپێچە، لە هەمان کاتدا گرژیی بەردەوام لەسەر لەفافەکە بهێڵەرەوە بۆ ئەوەی پەستانی بەردەوام هەبێت



Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848

# بۆری هەوا پێویستە بە کراوەیی بمێنێتەوە




چەند نیشانەیەک کە دەری دەخات بۆری هەوا دەکرێت گیرابێت:

- بریندارەکە لە ناخۆشی دایە و دەری دەخات کە ناتوانێ بە باشی هەناسە بدات
- بریندارەکە دەنگی پرخە یان غەرغەرە دەردەکات.
- لە بۆری هەواکەدا خوێن یان شتی نائاسایی بە ئاشکرا دەبینرێ
- دەموچاوی زامی سەختی پێوەیە

لە بریندارێکدا کە بۆری هەواکەی هیچ شتێک نەیگرتبێت، دەتوانی ئەم جۆرە جوڵەیەی لەسەر بکەی:






Images and c 848

# بۆری هەوا پێویستە بە کراوەیی بمێنێتەوە

یارمەتی بریندارێکی بە ئاگا بدە کە
بچنە شێوازێکی دانیشتن کە
ڕێگەیان پێدەدات بە ئاسانی هەناسە
بدەن



بۆ بریندارێکی بێ ئاگا
کە لە شۆکدا نییە لەشی
بخەرە شێوازی
چاکبوونەوەوە



# هەناسەدان

نیشانەکانی تەنگەنەفەسی دەکرێ ئەمانە لە خۆ بگرێ:

- کێشە لە هەناسەدان
- ژانێکی زۆر بۆ هێنانە ژوورەوە و دەرکردنی هەوا
- هەناسەدانەکە زۆر لاوازە و بەش ناکات (ئەگەر لە ٦ هەناسە کەمتر بێ لە خولەکێکدا)
- هەناسەدانەکە زۆر خێرایە (زیاتر لە ٢٠ هەناسە لە خولەکێکدا)
- خاڵەکەی سەروو ئەمە دەکرێ برینێکی سنگ لە ژێرەوە




## له ناوچەی سنگ و سکدا برین پڕمەکەرەوە!

به تیمار یان قوماشێکی پلاستیکی کە بتوانێ برینەکە داخات برینەکە داپۆشە.



Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848

# سووڕانی خوێن

**چەند هەنگاوێک بگرە بەر بۆ ڕێگەگرتن لە شۆک( شۆک: کەمبوونەوەیەکی مەترسیداری سووڕانی خوێن و ئۆکسجین بۆ ئەندامەکانی لەش)**

- سەرلەنوێ پشکنین بکە بۆ ئەوەی دڵنیابیتەوە کە کۆنترۆڵکردنی خوێنبەربوونەکە هێشتا کاریگەرە.
- دڵنیابەرەوە کە پەستێنکەرەکان هێشتا توندن.
- ئەگەر ئاساییە بە پێی باری بریندارەکە و برینەکانی، ئەوە قاچی بەرزکەرەوە.

**نشانەکانی شۆک ئەمانە دەگرنەوە:**

- هەناسە بڕکێ
- ئاگایی لەدەست و بە ئەستەمیی توانای سەرنجکردنی هەبێت.
- پێستەکەی شێدار و سارد و ئارەقاوی بێت.
- پێستەکەی ڕەنگی خۆڵەمێش یان سپی بووبێت.



Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848

# ساردی (هیپۆتێرمیا)

هیپۆتێرمیا بریتییە لە نزمبوونەوەیەکی مەترسیدار لە پلەی گەرمی لەشدا، زۆرجار بە هۆی پلەی گەرمای ساردەوە تووش دەبیت، پێویستە ئەمە بە وردی چاودێری بکرێت یان ڕێگری لێبکرێ کاتێک بەهۆی خوێنبەربوونی زۆرەوەبێ، نەک کەشی سارد.

**<u>نشانەکانی هیپۆتێرمیا:</u>**

- ئاخاوتنی قرتاو و ناتەواو و منگەمنگ کردن
- لەرز
- هەناسەدانی خاو و خەواڵوویی

**<u>بەم شێوازانە ڕێگری لە هیپۆتێرمیا بکە:</u>**

- جل بە بریندارەکەوە بهێڵەرەوە ئەگەر زۆر تەڕ نەبێت، ئەو کاتە دایکەنە جلەکانی.
- بریندارەکە هەڵگرە لەسەر زەوییەکە
- بریندارەکە بە پێخەف و چەرچەف داپۆشە، یان هەر ماددەیەک کە بتوانێ گەرمی بهێڵێتەوە.



Images and content credit: https://deployedmedicine.com/market/171/content/848

# برینداره‌كه بگوازه‌ره‌وه بۆ جێگای پارێزراو و چاودێری زیاتر

به‌رگریكه‌ره‌كان پێویسته ئاماده‌بن كه برینداره‌كانیان بگوازنه‌وه بۆ جێگای پارێزراو و بۆ جێگایه‌ك كه بتوانرێ فریاگوزاری زیاتریان بۆ بكرێ، پێویسته نه‌خۆش هه‌ڵگرێكی زۆر دروستكه‌ن (به دوو كه‌ست بتوانن بریندار هه‌ڵگرن)، هه‌مووی ئه‌وه‌ی پێویسته ستوونه (دار یان ئاسن یان پلاستیك) و كه‌ره‌سته‌یه‌ك (وه‌ك پێخه‌ف و چاكه‌ت و كراس). به‌م شێوه‌یه:



**نه‌خۆش هه‌ڵگری ده‌سكرد كه به ستوون و پێخه‌ف دروستكراوه**

بۆدروسكردنی نه‌خۆش هه‌ڵگرێكی ده‌سكرد ئه‌مه هه‌نگاوه‌كانن:

- پێخه‌فه‌كه بكه‌ره‌وه و ستوونێك دابنێ به درێژایی پێخه‌فه‌كه له ناوه‌ڕاستدا، پاشان پێخه‌فه‌كه به‌سه‌ر ستوونه‌كه‌دا بنوشتێنه‌ره‌وه.
- دووه‌م ستوون له ناوه‌ڕاستی پێخه‌فه‌كه نووشتێنراوه‌كه دابنێ.
- به‌شه‌كه‌ی پێخه‌فه‌كه كه ستوونی پێوه نییه، بنووشتێنه‌ره‌وه به‌سه‌ر دووه‌م ستوون و پاشان به‌سه‌ر یه‌كه‌م ستووندا.



نه‌خۆش هه‌ڵگری ده‌سكرد كه به چاكه‌ت و قه‌میس و ستوون دروستكراوه.

بۆ دروسكردنی نه‌خۆش هه‌ڵگرێك به قه‌میس یان چاكه‌ت، كراسه‌كه یان چاكه‌ته‌كه قۆپچه و زنجیری دابخه و هه‌ڵیگێڕه‌وه بۆ دیوه‌كه‌ی تر، به‌و شێوه‌یه قۆڵه‌كانی له ناوه‌وه ده‌بن، ئینجا ستوونه‌كه بهێنه به ناو قۆڵه‌كاندا بیبه.

# پاككردنەوە و خواردنەوەی ئاو

بەرگریکەری شار پێویستە ئاو بخواتەوە، دەتوانی تەنها چەند ڕۆژێک بێ ئاو بژیت، ئاوخواردنەوە زۆر گرنگە، دەمی وشک و ماندوویی و سەرئێشە و پێستی وشک و ئارەقەنەکردنەوە و گرژی ماسولکە و میزنەکردن بۆ ماوەیەکی زۆر، تەنانەت دڵەکوتێ و بوورانەوە، هەمووی نیشانەن، چەندین ڕێگا هەن بۆ پاککردنەوەی ئاو، ئاوی باران و بەفر کۆکەرەوە، بیکوڵێنە، دوو دلۆپ سپیکەرەوەی ناوماڵی تێکە، بۆ هەر لیترێک، یاخود ٥-١٠ دڵۆپ یۆد، ئەگەر هەر کاتێ دڵنیا نەبووی لە ئاوەکە، پاکی کەرەوە، خواردنەوەی ئاوی پیس دەبێتە هۆی ڕەوانی و ڕشانەوە و تەنانەت دەکرێ ببێتە هۆکاری وشکبوونەوەی زۆر و مردنیش.

چۆنێتی پاککردنەوەی ئاو



# خشتەی پاککردنەوەی ئاو

| بڕی دەرمانی کلۆرین بە بەکارهێنانی ٪٥ کلۆری ماڵان (بێ بۆن) و ٪٧٠ هیپۆکلۆریت | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بۆ ١٩ لیتر ئاو | بڕی دەرمانی ٪٥ی کلۆری ماڵان (بێ بۆن) | | | | | |
| | ١ میلیگرام/لیتر | ٢ میلیگرام/لیتر | ٥ میلیگرام/لیتر | ١٠ میلیگرام/لیتر | ١٠٠ میلیگرام/لیتر | |
| | ٦ دڵۆپ | ٠.٧٥ مل | ١.٩ مل | ٣.٨ مل | ٣٩.٤ مل | |
| | بڕی دەرمانی ٪٧٠ هیپۆکلۆریت | | | | | |
| | ١ میلیگرام/لیتر | ٢ میلیگرام/لیتر | ٥ میلیگرام/لیتر | ١٠ میلیگرام/لیتر | ١٠٠ میلیگرام/لیتر | |
| | ٠.٩ مل | ١.٧ مل | ٤.١ مل | ٨.٣ مل | | |

# بەفر و باران

باران – ئاوی بارانی تازە کە کۆبکرێتەوە ناو دەفرەوە پێویستە بە پاڵاوتن نییە، بەڵام ئە ئاوی بارانەی بە خانوو و گەڵا و دار و درەختدا دێتە خوارەوە دەکرێ ئاوەکە پیس بکات و پێویستی بە پاککردنەوە هەیە، ئاوی باران کۆبکەرەوە لە ڕێی دانانی دەفرەوە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ بارانەکە بگرێت کاتێ یەتە خوارەوە.

**بەفر** – بەفری تازەی پاک بەکاربێنە وەک سەرچاوەیەکی ئاو، دەبەی پڕ لە بەفر دابنێ لە نزیک ئاگرەوە یان لە نێو چینی جلدا بۆ ئەوەی پلەی گەرمیی لەش بیتووێنێتەوە، ئاو بکەیت بەسەر بەفردا یارمەتی دەدات زووتر بتووێتەوە، هەوڵبدە بە ڕاستەوخۆ بەفر نەخۆی چونکە پلەی گەرمیی لەش کەم دەکاتەوە و وا لە لەشت دەکات وزەی کۆکراوەی زیاتر بەکاربێنێ وەک لە ئاو.

# پاکوخاوێنی

نەخۆشی دەکرێت لە فیشەکی دوژمن بەرگریکەر زیاتر بکووژێت.

لە کۆندا، نەخۆشی و برینی دەرەوەی جەنگ ڕێژەی ٪۸۰ی زیانی جەستەیی بوون، تەنانەت بۆ باشترین هێزە سەربازییەکانی جیهان، لەم سەردەمەدا، هێزە سەربازییەکان ستاندەردی پاک و خاوێنی زۆر توندیان هەیە، بە هەمان شێوە هێزی بەرگریکەر دەبێت هەمان ستاندەردی هەبێت.

# دەستت بە پاکی بهێڵەرەوە

یەکێک لە کاریگەرترین نەریتەکان بۆ هێزی بەرگریکەر ئەوەیە کە دەستیان بە بەردەوام پاکوخاوێن بکەنەوە بۆ ئەوەی خۆیان و دەوروبەریان لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بپارێزن.

هێزی بەرگریکەر پێویستە دەستیان بە خاوێنی بهێڵنەوە بە بەکارهێنانی کوهول یان سابوونی دژە بەکتریا، لەم کاتانەدا(بە لایەنی کەمەوە):

- پێش نانخواردن
- پاش نانخواردن
- پێش ئامادەکردنی خواردن
- دوای بەکارهێنانی دەست شۆر
- پاش بەکارهێنانی هەر شتێک کە دەکرێ میکرۆبی پێوە بێت.



# خواردن و ئاو بە پاکی بهێڵەرەوە

سەرئاو و جێگای پیسایی هەوڵبدە تا دەتوانی دوورخەرەوە لە خواردنەکانت (١٠٠ مەتر یان زیاتر)، ئەم ژمارەیە پێویستە هەوا و بەرزاییش هەژمار بکات.

سەرئاوەکان با لە خوارەوەی سەرچاوەی ئاوییەوە بن وەک بیر و جۆگە (دووری ٣٠ مەتر یان زیاتر).

ڕێگە مەدە مێش و مێروو بنیشنەوە لەسەر خواردنەکەت.



# یاساکانی جەنگ

هێزی بەرگری شار پێویستە پەیڕەوی یاساکانی جەنگ بێت، بنەما گشتییەکانی یاساکانی جەنگ وەک ڕێنیشاندەرێکی گشتی وان بۆ چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لە کاتی جەنگدا، بنەماکان ئەمانەن:

**پێویستیی سەربازی** – واتە هەمووو ئەو پێداویستییانەی کە پێویستن بۆ کۆتایی هێنان بە جەنگێک بە خێراترین و چاکترین شێوە، بەڵام پێویستە بە پێی یاساکانی جەنگ بڕۆن.

**جیاکاری** – هێزی بەرگری پێویستە بەردەوام کەسی سیڤیل لە دوژمن جیابکاتەوە، کەسی سیڤیل بە هەموو شێوەیەک پارێزراون لە زیان، بەڵام کاتێک کە دەست دەکەن بە یارمەتی دانی جەنگەکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەو پاراستنە لەدەست دەدەن و وەک چەکدار هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت.

**بەراوردکردن** – ئەم بنەمایە وا لە سەرکردەی سەربازی دەکات کە خۆی بەدوور بگرێ لە چالاکییەکی سەربازی کە ببێتە هۆی زیانێکی مرۆیی و ماددی زۆر بە بەراورد بە سوودەکانی، ئەم بنەمایە هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پلانی باش دابنرێت پێش چالاکی سەربازی بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە کە کەمترین زیانی جەستەیی و ماددییان هەبێت بۆ کەسانی سیڤیل.

# یاساکانی جەنگ( بە شێوەیەکی کرداری)

**یاساکانی جەنگ شتێک نین کە بە پێی ئارەزوو بن، بۆ ئەوە دانراون کە ئازاری جەنگ کەمکەنەوە لەسەر مرۆڤ:**

- کەسی سیڤیل مەکە بە ئامانج
- ڕێز لە بنەماکانی جیاکردنەوە و تەبابوون بگرە.
- هەموو هۆشیارییەکی پێویست بگرە بەر بۆ کەمکردنەوە و ڕێگریکردن لە زیانی لابەلا بۆ سەر کەسانی سیڤیل.
- کەسانی سیڤیل وەک قەڵغانی مرۆیی بەکار مەهێنە.
- هەرگیز هێرشی نەشیاو و جیانەکراوە مەبە، واتە بەردەوام ئاگادار بە لەوەی کەسانی سیڤیل نەبنە ئامانج.
- شوێنی سیڤیل مەکە بە ئامانج، وەک خوێندگا یان نەخۆشخانە
- هەرگیز زیندانی و کەسی سیڤیل ئەشکەنجە مەدە و مەیانکووژە.
- زیندانییانی جەنگ پێویستە بە شێوەیکی مرۆڤدۆستانە ڕەوشتیان لەگەڵ بکرێت.
- کارمەندی خێرخوازی مەکووژە و مەیانفڕێنە.
- ڕێگە بدە یارمەتیی خێرخوازی بگات بە شوێنی مەبەست و ڕێگای پارێزراویان بۆ بڕەخسێنە کە یارمەتی پێویست بگەیەنن بە ناوچەکان.
- ئاگاداری یاسا شکاندن بە و ئەو کەسانە سزا بدە کە یاساکان دەشکێنن.

# پاراستنی دانیشتوان

هێزی بەرگریکەر پێویستە دانیشتوان و کەسی سیڤیل بپارێزن، ئەوان کۆنترۆڵیان هەیە بەسەر ئەوەی هێز و کەرەستەی سەربازی لە کوێی دانیشتوانەکە دادەنرێن، هێزی بەرگریکەر زۆرجار زانیاری باشتریان هەیە بە بەراورد بە هێرشکەر لەسەر شوینی دانیشتوان و بۆیە دەتوانن باشتر بیانپارێزن لە مەترسی. کردەوە تەکتیکی و ستراتیجییەکانی هێزی بەرگری دەکرێ مەترسی لەسەر دانیشتوان زیاد بکەن، بۆ ڕێگری کرد لەوە، ڕەچاوی ئەم خاڵانە بە:

١. ڕێز لە یاسای نێودەوڵەتیی و مافی مرۆڤ بگرن.

٢. ڕێنمایی دەربکرێ کە پاراستنی دانیشتوان گرنگە.

٣. ئامانجی سەربازیی مەخە جێگای سیڤیلەوە، یان ئەو جێگایانەی کە کەسانی سیڤیل بەکاری دەهێنن وەک خوێندنگە و جێگای نیشتەجێبوون و نەخۆشخانە و جێگای ئایینی (مزگەوت و کڵێسا)، هەروها ڕێککەون لەگەڵ دانیشتوانەکەدا کە شوێنەکان جیا بکەنەوە بۆ ئەوەی ژیانی دانیشتوانەکە نەخەنە مەترسییەوە.

٤. هێزی بەرگریکەر پێویستە جلوبەرگ و نیشانەی تایبەت بپۆشن کە جیایان بکاتەوە لە کەسی سیڤیل (ئەمە وەک باندێک لە قۆڵ پێچرابێ)

٥. دانیشتوان ئاگادار بکەنەوە دەربارەی هێرشی دوژمن، ئەمە ئیتر لە ڕێی شاور(فیکەی) وریاکردنەوە بێت یان تۆری کۆمەڵایەتی یا نامەی مۆبایل یان بڵندگۆ، بۆ ئەوەی کاتی پێویستیان هەبێت دانیشتوانەکە بۆ دۆزینەوەی جێگای پارێزراو.

٦. پێشوەخت دانانی خوارد و ئاو و کەلوپەلی فریاکەوتن بۆ دانیشتوان.

٧. بەردەوام ڕێگە بدە بە کۆمەڵەی خێرخوازی کە بە ئازادی هاتووچۆ بکەن، بۆ ئەوەی خێرا بتوانن خوارد و ئاو و کەلوپەلی فریاگوزاری و کەسانی بریندار بگوازنەوە لە جێگایەکەوە بۆ جیگایەکی تر.

٨. جێگا پارێزراوەکان بە ڕێکوپێکی نیشانەبکە، واتە خوێندنگە و مزگەوت و پەناگە و هتد... ئەمە بۆ ئەوەی هەرگیز جێگا تێکەڵ نەکەی لەگەڵ دانیشتوان و ژیانیان بخەیتە مەترسییەوە.

٩. ئەو جێگایانە دیاری بکە و نیشانەیان بکە کە مینی چنراو و تەقەمەنی تیادایە کە هێشتا نەتەقیونەتەوە.

١٠. ڕێگای پارێزراو بۆ دەربازبوونی دانیشتوانەکە دیاریبکە.

١١. ئامۆگاری دانیشتوانەکە بکە لەسەر فریاگوزاری سەرەتایی و کەلوپەلی فریاگوزاری سەرەتایی و پەستێنکەر (تۆڕنیکە) دابەش بکە بەسەریاندا.

١٢. ئامۆژگاری دانیشتوان بکە کە بە دووربین و کامێراوە لە پشت پەنجەرەوە نەوەستن چونکە دەکرێ دوژمن بە نیشانەشکێن هەژماریان بکەن و لێیان بدەن.

١٣. دڵنیا بەرەوە کە دانیشتوانەکە چەند کەلوپەلێکیان لەبەردسەتدایە وەک پێخەفی دژە ئاگر و کەرەستەی لابردنی ڕووخاویی و دەرمانی پاککردنەوەی ئاو و جانتای لاشە و نیشانەی تایبەت بۆ جێگای مەترسیدار و هەروەها دەرمانی ژەهر بۆ بەکارهێنانی لە کاتی هێرشی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجیی.

١٤. تیپی تەندروستی تایبەت ڕابێنە و دایانمەزرێنە لە شوێنی دانیشتواندا، پێویستە بزانن چۆن چارەسەری برینی فیشەک و شکاوی و تەقینەوە و سووتان بکەن هەم بۆ منداڵ و بۆ گەورەش، چونکە پێکهاتەی ئێسکی منداڵ و گەورە جیاوازن لە یەک.

١٥. ئەگەر لە توانادا هەبوو، خزمەتگوزاری گرنگی دانیشتوان چاککەرەوە، وەک پاڵاوگەی ئاو و بنکەی کارەبا.

# هەڵسووکەوت کردن لەگەڵ دیلی سەربازیی دوژمن

بەرگریکەری ناوشار دەکرێ چەند دیلێکی دوژمن بگرێ، بەردەوام ئەم دیلانە بە شێوەیەکی مرۆڤدۆستانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە، شوێن ئەم ڕێنماییانە بکەوە:

- **پشکنین** – دیلەکان بپشکنە بۆ فیشەک و زانیاری و چەک و هەروەها کەلووپەلی نائاسایی.
- **بێدەنگی** – ڕێگە مەدە بە دیلەکان بدوێن (لەگەڵ یەکتریشدا) و ڕێگە مەدە کەس بدوێ لەگەڵیاندا، تەنها بۆ فەرمان پێدان.
- **جیاکردنەوە** – دیلەکان بە پێی پلە و نەتەوە و بارودۆخ و ڕەگەز جیاکەرەوە.
- **پاراستن** – دیلەکان لە زیان بپارێزە بە پێی ڕێککەوتننامەی جنێف، ئەمە زیانی جەنگیش دەگرێتەوە، ئەگەر پێویستیان پێبوو چاودێری پزیشکیشیان بۆ بکە.
- **بە خێرایی بۆ دواوە** – بە زووترین کات دیلەکان لە شوێنی جەنگەوە بگوازەرەوە بۆ بەشی دواوە.

*US Army Training Circular 3-21.76

# تەقینەوەی خەوتوو (نەتەقێنراوە)

لە جەنگی ناوشاردا، بۆمب و ڕوومانە و هاوەن و چەندین فیشەکی قورسی تر دەبن کە ئەکەون و ناتەقنەوە، هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا، دوژمن دەکرێ مین و داو و شتی تر دابنێ.

هەموو تەقینەوەیەکی خەوتوو وەک زیندوو ببینە، زۆر مەترسیدارن، ئەم بنەمایانە بەکاربێنە.

بیناسەرەوە – بیناسەرەوە کە ئەم تەقەمەنییانە زۆر مەترسیدارن ،
بەتایبەتی بۆ منداڵ کە دەکرێ لێیان نزیکببنەوە.
بگەڕێوە – دەسکاری مەکە و مەیجووڵێنە و نزیک مەبەرەوە لێی.
هەواڵدان – هەواڵ بدە بە لێپرسراوەکانت.

